بەرەو چارەسەرێکی گونجاو

# گەنج و جیهانگیری

هەوڵێك بۆ بەرچاوڕوونی و ئاشناکردنی گەنج بە جیهانگیری و بەرهەمەکانی،
هەروەها تیشکخستنەسەر هەنگاوەکانی داهێنانی گەنج لە جیهانگیری

د. ئیدریس کاریانی





# گەنـج و جیهانگیری

**نووسینی: د. ئیدریس کەریم کاریتانی**

**ڕێکخستنەوە و پێداچوونەوە و هەڵەگری: گرووپی ماهان**



چاپی یەکەم – ٢٠٢٣ (١٤٤٤ك)



**نوسینگەی تەفسیر**
بـۆچـاپ و بڵاوکـردنـەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست: نووسینگەی تەفسیر
کاریتانی، ئیدریس کەریم
گەنـج و جیهانـگیری، ئیدریس کەریم کاریتانی (نووسەر)
١٦٨ لاپەڕە
١٧* ٢٤ سم
بابەت: هزری ئیسلامی
ISBN: 978-9922-679-54-9

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەسپاردنی (٩٦٣)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.

"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیروبۆچوونی نووسینگەی تەفسیر بێ."

# گەنج و جیهانگیری

(هەوڵێك بۆ بەرچاوڕوونی و ئاشناکردنی گەنج بە جیهانگیری و بەرهەمەکانی، هەروەها تیشکخستنەسەر هەنگاوەکانی داهێنانی گەنج لە جیهانگیری)

د. ئیدریس کاریتانی

بسم الله الرحمن الرحيم

- ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ ﴾ الكهف: ١٣

- قال النبيّ (عليه الصلاةُ والسلام): "اغْتَنِمْ خَمْسًا قبلَ خَمْس: شَبابَكَ قبلَ هرَمِكَ، وصِحَّتَكَ قبلَ سَقَمِكَ، وغِناكَ قبلَ فَقْرِكَ، وفَرَاغَكَ قبلَ شُغْلِكَ، وحَياتَكَ قبلَ مَوْتِكَ". أخرجه الحاكم في المستدرك رقم (٧٨٤٦) ٣٤١/٤ وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، وصححه الألباني في صحيح الجامع رقم (١٠٧٧).

گوڵێك پیشكەشە بە:

- گەنجانی بەهێزی ئەمڕۆ، نەوەی داهاتوون،

- ئەوانەی هیممەتبەرزن و خاوەنی ئومێدی گەورەن،

- خاوەنی عەقڵ و ژیری و داهێنان و هۆشیارین،

- هەست بە بەرپرسیاریەتیی ئایین و نیشتمان و خاك و خەڵك دەكەن،

- بەردەوام بۆ بونیادنانی ژیانێكی ئاسوودە و كامەران لە بیری داهاتوودان،

- ئەوانەی لەگەڵ نوێكاری و تەكنەلۆژیای سەردەمدا هەنگاو دەنێن،

- ئەوانەی جیهانگیری و بەرهەمەكانی وەك دەرفەتێك بۆ هەستانەوەی ئوممەتی ئیسلامی دەزانن.

**سوپاس و پێزانین**

سوپاس و پیزانینم بۆ ئەو گەنجانەی کە خوێنەری بەردەوامی بابەتی هۆشیاری و پێگەیاندنن، سوپاسی بێپایاینم بۆ برای بەڕێز و هاوڕێ و هاوکار و هاوبیرم کاك هۆشەنگ ئالانی؛ بەڕێوەبەری کەناڵی بەها، کە دەرفەتی ڕەخساند ئەم بابەتانە بە شێوازی بەرنامە لە کەناڵەکە پێشکەش بکەم، هەروەها سوپاسم بۆ کاك هێمن فەرید کە بابەتەکەی بە پێشنیار و تێبینیی جوان ڕازاندەوە، هەر کەسێك بە وشەیەك لە نووسین و داڕشتنی ئەم کتێبەدا بەشدار بوویێت.

**شێوازی ئەم نووسراوە**

هەر نووسینێك شێواز و مەنهەجیەتێکی تایبەتیی خۆی هەیە، بە پێی تێڕوانینی نووسەر و ئامانجی نووسینەکە مەنهەجیەتی دەگۆڕدرێت، ئەم نووسراوە بە شێوازی مەنهەجی ئەکادیمی نەنووسراوە، چونکە ئەم نووسراوە تەوەرەکانی زیاتر لە چوارچێوەی فیکری و هۆشیاری و ئاراستەکردنی گەنجاندا دەسووڕێتەوە، بۆیە شێوازی زانستیی ڕووتی وەرنەگرتووە تا بە پێی مەنهەجیەتی زانستی دابڕێژرێت. ئەمە بۆ بەرچاوڕوونیی خوێنەر، تا خەریکی ڕەخنەی ئەکادیمی نەبێت.

## دەروازە

دنیا بە خێراییەکی یەکجار سەیردا تێدەپەڕێت، بەرهەمەکانی جیهانگیری ڕۆڵی سەرەکییان لە بەرەوپێشبردن و خێراکردنی ژیان هەیە، هیچ بوارێکی ژیان وەك خۆی نەماوەتەوە، هەمووی بە سەدان جار لە پێشوو خێراتر بووە. داهێنانەکان بە هۆکاری بەرهەمەکانی جیهانگیری بە ئەندازەیەك بەرەوپێش چوون، ژیانی مرۆڤەکانی کردووەتە ئەلکترۆنیات و هەستەوەر، خزمەتێکی بێوێنەیان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە. لە مێژووی هاتنی مرۆڤ بۆ سەر زەوی، بە ئەندازەی ئێستا مرۆڤ پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەبینیوە. جیهانی ڕۆژئاوا لەدوای هەستانەوەیان و سوودوەرگرتنیان لە جیهانی ئیسلامی و زانکۆ و زاناکان، ئێستا ڕۆڵی سەرەکییان لەم پێشکەوتن و خزمەتکردنە لە بوارە جیاجیاکاندا هەیە. واتە ئەورووپا خاوەنی داهێنان و شارستانیەتی تەکنەلۆژیایە لەم سەردەمەدا، لە ڕووی ئاسانکردن و یارمەتیدانی ماددییەوە ئاسانکاریی زۆریان بۆ ژیانی مرۆڤ کردووە، بێگومان ئەمەش ڕێگر نییە لەگەڵ شەریعەت و پەیامی خودا، سروشتی مرۆڤیش پێی خۆشە خۆشبەخت و خۆشگوزەران بێت و ژیانی بۆ فەراهەم بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆژئاوا لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە تەواو ماددەگەراییە و بە تیۆری "لا الە والحیاة مادة" بەڕێوە دەچێت، لەولاشەوە جیهانگیری بەتەواوی کەوتووەتە دەست هێز و کۆنترۆڵی فیکری سەرمایەدارییەوە، کێشەی زۆری بۆ بەرهەم و خودی جیهانگیرییش دروست کردووە، مرۆڤیش لەم ناوەندەدا بووەتە سووتەمەنی، لەبریی ئەوەی خۆشگوزەران و بەختەوەر بێت، ماڵوێران و گۆشەگیر و خەمۆك بووە، چونکە ماددەگەرایی هەموو بەها و ئەخلاقە باڵاکان لە مرۆڤ دادەڕنێت و دەیکاتە ماددییەکی ڕووت، شتێك نامێنێتەوە بە ناوی بەها و ئەخلاق و سۆز و مرۆڤبوون و

خێر و چاکە و تا دەگاتە بڕوانەبوون بە پاداشتی دوارۆژ و دوارۆژیش بە خۆی، لەولاوەش تیۆری "لا اله والحیاة مادة". ژیان دەبێتە شوێنی ململانێی بەدەسەڵات و بێدەسەڵاتەکان، لەنێوان هێز و بێهێز لەسەر ئەساسی "الغایة تبرر الوسیلة" تاگر لە گیانی مرۆڤی بێدەسەڵات بەر دەدات و بۆ گەورە و بەدەسەڵاتەکان دەیانکاتە سووتەمەنی. بەرهەمەکانی جیهانگیری لەژێر تیڕوانینی ئەم دوو تیۆرە بۆ شەڕ و ئاژاوە بەکار دێت. یەکتر ڕەشکردنەوە، کاری سیخوڕی بەسەر یەکەوە، دروستکردنی چەکی ئەتۆمی و... هتد، هەمووی بۆ خۆسەپاندن و چەوساندنەوە و گێڕانەوەی جارێکی تری مرۆڤە بۆ بازنەی کۆیلایەتی. هۆکاری سەرەکی لەم ناوەندەدا نەبوونی ئامانجە لە ژیاندا، بە واتای وەرگرتنی پاداشت لە دوارۆژ و سەروەربوون و جێنشینایەتیی مرۆڤ لەسەر زەوی. لە بنەڕەتدا هەموو داهێنان و تەکنەلۆژیا و شارستانیەتێك دەبێت لە خزمەتی مرۆڤدا و بۆ مرۆڤ بێت، ئێستا لەژێر چەتری ئەم تیۆرانەدا ئامانجەکە بۆ بەسووتەمەنیبوون و قوربانیبوونی مرۆڤ بۆ هەموو ماددییەکان گۆڕاوە. لێرەوە چۆن بتوانین ئەم هەموو بەرهەمە جوانەی جیهانگیری و جیهانگیری خۆیشی بکەینە کاڵایەکی جوان بۆ باڵای مرۆڤێکی بەختەوەر، ئەوەش لەوەوە سەر دەگرێت تیۆری "لا اله والحیاة مادة" بە درووشمی بەرزی مرۆڤبوون بە "لا اله الا الله محمد رسول الله" بگۆڕین، هەروەها تیۆری "الغایة تبرر الوسیلة" بکەینە "الوسائل السلیمة الصحیحة لغایة نبیلة"، واتە بەکارهێنانی ئامرازی دروست و تەواو بۆ ئامانجی ڕاست.

بەکارهێنانی ئامرازی ڕاست و دروست بۆ ئامانجی پاك و بێگەرد، لەوێوە مرۆڤ بە هەموو جۆرە ئایدیایەکەوە خۆی دەدۆزێتەوە و بەختەوەری و کامەرانیی پێ دەبەخشرێتەوە، ئەمەش چاوەڕوان دەکرێت هەستانەوەیەك لەلایەن بیرمەندان و ڕۆشنبیران و گەنجانەوە بکرێت، تا بتوانن لەم هەموو بەرهەمی جیهانگیرییە داهێنان بکەن، بە هەمان داهێنانی ڕۆژئاوا یان زیاتر، بەڵام بە ئامانج و ئامراز و بەهای بەرز و ئەخلاقی جوان. لێرەوە گرنگە گەنج بیر لەم خەزێنە گەورەیەی جیهانگیری بۆ بەختەوەریی خۆی و مرۆڤ بەگشتی بکاتەوە. ڕۆژئاوا لە هەستانەوەی زانستی و تەکنەلۆژیی خۆی سوودی لە زانکۆ و زاناکان و شارستانیەتی

ئیسلامی وەرگرت، خۆی لە تاریکایی و ستەمی سێ سەد ساڵە ڕزگار کرد. ئێستا ڕۆژی تۆیە ئەی گەنج، بە بەرهەمەکانی جیهانگیری خۆت لە ستەم و تاریکی و نەزانیی سەد ساڵە ڕزگار بکەیت، بۆیە ئەم نووسراوە وەك دەروازەیەکی کاروان و پڕۆژە یەکلەدواییەکەکانی بەندەیە بۆ هەستانەوە و چوونە پێش و ڕزگاربوونمانە لەم دواکەوتوویی و نەزانی و پاشەکشەیە.

٢٠٢٢/٨/١٦

هەولێر - کوردستان

## کێ سوود لەم کتێبە وەردەگرێت؟

ئێستا نووسراو یەکجار زۆرە، لە بابەت و ناونیشانی جیاواز، بەتایبەتی بە زمانە جیاوازەکانی تری وەکوو ئینگلیزی و عەرەبی، بەڵام کتێبخانەی کوردی لە زۆر بابەتدا هێشتا وەك پێویست نییە، گەنج و تازەپێگەیشتووی ئەمڕۆش لە زمانی عەرەبیدا لاوازن، هەروەها بەشێکی زۆر لە بابەتەکانی ئەمڕۆ کۆکردنەوەن، یان لایەنی ئایینیان گرتووە، ئەم جۆرە نووسینەش لە کۆمەڵگای ئێمەدا خوێنەری زۆرە، ئەمەش کارێکی باشە گەنجان و کۆمەڵگامان ئایینپەروەر بن و ئایینیان باش بێت، بەڵام ئەمە لایەنی ڕۆشنبیری و هەڵسوکەوت و پێشکەوتن و داهێنان و جووڵە و گۆڕانکاری لەناو تاك و کۆمەڵگا دروست ناکات، ناتوانێت لەگەڵ دنیای پیشکەوتن و تەکنەلۆژیا و جیهانگیریدا هەنگاو بنێت و بەجێ دەمێنێت. ئەم نووسراوەی بەردەستت جیاوازە و بەشێکە لە هەنگاوی داهێنان و پێشکەوتن و متمانەبەخۆبوون و هەستانەوە، هەروەها دەروازەیەکە بۆ خۆڕۆشنبیرکردن لە دنیای جیهانگیری و بەرەوپێشچوونی کاروانی فیکری، بۆیە ئەوانەی سوود لەم کتێبە دەبینن:

١. ئەو گەنجانەی کە مەبەستیانە هەرێمی کوردستان بەجێ نەهێڵن و گۆڕانکاریی تیدا بکەن، وەك شاخ لەبەرانبەر گەندەڵکاران بە زانست و زانیاری بوەستنەوە.

٢. ئەو گەنجانەی کە هەست بە بەرپرسیاریەتیی ئیسلام و خۆیان و خاك و خەڵك و نیشتمان دەکەن.

٣. ئەو گەنجانەی کە بیریان تیژە و بەدوای دەروازەی هەستانەوەدا دەگەڕێن، بۆ ئەوەی جێپەنجەی خۆیان لەناو کۆمەڵگادا بەجێ بهێڵن.

٤. ئەو گەنجانەی کە تێکەڵن لەگەڵ دنیای جیهانگیری، بەڵام بەدوای بەرچاوڕوونیی زیاتردا دەگەڕێن، بۆ ئەوەی بیکەنە پەیژەی داهێنان و پێیدا سەر بکەون.

٥. ئەو گەنجانەی کە خولیایان خزمەتکردنە، خولیای داهێنان و پێشکەوتنن.

٦. ئەو گەنجانەی کە متمانەیان بە خۆیان و تواناکانیان هەیە، لە داهاتوودا دەبنە خاوەنی کوردستان و ئاوەدانی دەکەنەوە.

٧. ئەو گەنجانەی کە ئینتیمای نیشتمانییان بەهێزە و خۆشەویستییان بۆ نیشتمان بە خزمەتکردن دەردەبڕن، بۆ ئەوەی لەدەستی گەندەڵکاران دەریبهێنن.

٨. ئەو گەنجانەی کە دەیانەوێت ژیانێکی ئاسوودە و بەختەوەر لە کوردستاندا فەراهەم بکەن، تا نەهێڵن چیتر گەنجانمان وڵات بەجێ بهێڵن و لە دەریاکاندا بخنکێن و ببنە خۆراکی دەریا.

٩. ئەو گەنجانەی کە خاوەنی داهێنانن، بەڵام دەرفەتیان بۆ نەڕەخساوە، یان وەك پێویست گرنگییان پێ نەدراوە تا لە ڕێگەی جیهانگیری توانای خۆیان خەرج بکەن.

١٠. ئەوانەی کە شەو و ڕۆژ لە بیری هەستانەوە و پێشکەوتندان، لە خەمی ئیسلام و موسوڵماناندان، لە خەمی جارێکی تر گەڕانەوەی شارستانیەتی ئیسلامیدان.

# پێشەکی

گەنج و جیهانگیری دوو بابەت و دوو ناونیشانن، دوو چەمك و دوو زاراوەن، هەریەکێك لەوانە باسێکی فراوانە و تەوەرەیەکی گەورەیە و جیهانێکی سەربەخۆیە.

جیهانی گەنج جیهانێکی تایبەت و سەربەخۆ و گرنگە، دنیای جیهانگیرییش (عەولەمە) ئەمڕۆ دنیای بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە، دنیای کردووەتە یەك "دێ"ی بچووك.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە: ئایا ئەم جیهانگیرییە، کام جیهانگیرییەیە؟ جیهانگیریی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری، ڕۆشنبیری، یان جیهانگیریی تەکنەلۆژیا و بواری تۆڕەکانی کۆمەڵایەتی و سۆشیالمیدیا و فۆڕجی و فایفجییە!

ئەمانە هەموویان پێویستیان بە وردبوونەوە و بە ڕاوەستانی زیاتر و ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە.

کۆکردنەوەی گەنج لەگەڵ جیهانگیری کۆمەڵێك پرسیار لەخۆ دەگرێت، لەوانە: ئایا ئەم کتێبە و بابەتەکانی ناوی، ئامانج تێیدا چییە؟ هەروەها جیهانگیری چییە؟ شوناس و پێناسەی جیهانگیری چییە؟

ئایا جیهانگیری بەتەنیا لەگەڵ جیهانگیریی ڕۆشنبیری جیاوازییان هەیە و بەها و گرنگیی ئەو بابەتە لە چیدایە؟ چۆن گەنج لەگەڵ جیهانگیری نزیك بکەینەوە و بە یەکتریان ئاشنا بکەین؟ ئایا ئاشنابوونی گەنج لەگەڵ جیهانگیری، لێك نزیکە؟ ئایا پێویستە، حەوجێی هەیە و ناچارە؟

ئایا ئەمڕۆ گەنج پێویستی بەوەیە لەگەڵ جیهانگیریدا یەکتر بناسن؟ چۆن هەڵسوکەوتێکی ڕاست و دروست و ستاندارد لەنێوان گەنج و بەرهەمەکانی جیهانگیریدا بکرێت؟

ئەم حاڵەتانەی کە پێی دەڵێن ئەرێنییەکانی جیهانگیری بۆ گەنج، ئایا ئەو ئەرێنییانە چین کە گەنج سوودیان لێ وەربگرێت؟

بەپێچەوانەشەوە، ئایا ئەو نەرێنییانەی کە جیهانگیری لەسەر عەقڵی گەنج و لەسەر ئەتەکێتی گەنج، لەسەر ڕۆشنبیری و هەڵسوکەوتی گەنج، لەسەر سلووکی گەنج، لەسەر کات و فەراغی گەنج و لەسەر بیروباوەڕ و فەرهەنگ و کولتوور و هەویەی گەنج چین؟ ئەمانە هەموو بابەتن، هەموو پرسیارن، هەموو کۆمەڵێك گیروگرفت و لێڵی و ناڕوونین کە ڕۆژانە گەنج پێیانەوە سەرقاڵە.

گەنج لە خۆی دەپرسێت: لەگەڵ جیهانگیریدا چی بکەم؟ ئایا بەرهەمەکانی جیهانگیری خزمەتی بەو کردووە؟ ئایا جیهانگیری کاتێك هاتووە، ژیانی گۆڕیوە؟ کاتەکانی بۆ پڕ کردووەتەوە؟ ئایا هەر بەڕاست بەختەوەری و ئارامی و هێوریی پێ داوە؟ گەنج لە خۆی دەپرسێت: ئایا ئەو هەنگاوە بایەخدارانەی کە لە دنیای جیهانگیریدا پێی دراوە، کامەن؟

ئەمانە هەموویان پرسیارگەلێکن لەلای گەنج دروست بوون و دەمانەوێت لەم زنجیرە بابەتانەی ناو ئەم کتێبەدا کە ناوی گەنج و جیهانگیرییە، وەڵامیان بدەینەوە.

## تەوەری یەکەم:

## سەرەتا و هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی لەبەر چی و بۆچی گەنجمان هەڵبژاردووە، دەڵێین:

ئایا ئێمە نازانین گەنجینەی میللەتان گەنجن؟ ئایا نازانین بنەماکان و بناغە و هیوای تەواوی گەلەکان؛ گەنج و لاوەکانن؟ ئایا نازانین نهێنیی هێز و پێشکەوتن و شارستانیەتی ئێستا و داهاتووی میللەتان؛ هەمووی گەنجە؟

ئایا نازانین گەنج ئەمڕۆ زۆر پێویستی بەوەیە ئاڕاستە بکرێت کە چی بکات و بەڕاستی بایەخی پێ بدرێت؟ ئایا ئەمڕۆ گەنج کاریگەریی زیاتر دەبێت لەگەڵ جیهانگیری، یان جیهانگیری کاریگەریی زیاتر دەبێت لەگەڵ گەنج؟

بە پێی دوایین ئاماری وەزارەتی پلاندانان، عێراق بە وڵاتە گەنجەکان هەژمار دەکرێت، بە هۆکاری ئەوەی ڕێژەی تەمەن زۆر کورتە کە بە شێوەیەکی گشتی پەنجا و هەشت ساڵە. بە هۆکاری زوو مردنی مرۆڤ، زۆربەی دانیشتووان کە ٥٦%ی گەنجە، زۆرینەی دانیشتووانی عێراق و هەرێمی کوردستان پێك دەهێنێت. ئەو ڕێژەیە لە ڕووی سیاسی، کۆمەڵایەتی و هێزی کارەوە هەژمار دەکرێت.

لە لایەکی ترەوە ئەوەی کە زۆر بەئاسانی دەکەوێتە ژێر کاریگەریی بەرهەمەکانی جیهانگیرییەوە، هەر گەنج و لاوەکانن. ئەمڕۆ گەنج لە هەموو توێژەکانی تر سەرقاڵترن، بە چییەوە سەرقاڵن؟ بە بەرهەمەکانی جیهانگیرییەوە: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و سۆشیالمیدیا و کاریگەرییەکانی سۆشیالمیدیا. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا تووشی لادان و سەرکێشی دەبێت. ئەمانە هەموویان پێمان دەڵێن بەڵێ، گەنج شیاوی گرنگیپێدانن.

جیهانی ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە ناویشیاندا هەرێمی کوردستان، زۆر بەقووڵی هەڵسوکەوت لەگەڵ جیهانی جیهانگیری و سۆشیالمیدیا و بەرهەمەکانی جیهانگیریدا دەکات، بەبێ شارەزایی و سانسۆر.

گەنجانی جیهانی ئیسلامی ژمارە و ڕێژە و بەشداربوونیان زۆر زیاترە لەگەڵ جیهانی ڕۆژئاوا، لە کاتێکدا داهێنانی جیهانگیری و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و شۆڕشی زانیاریی ئەم سەردەمە بەرهەمی ئەورووپا و ڕۆژئاوایە نەك جیهانی ئیسلامی.

بە پێی هەندێک لە توێژینەوە سەرژمێرییەکان، دەرکەوتووە یەك ملیار و پۆینت هەشت (١,٨) کەس لە جیهانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سەرقاڵ و وابەستەن بە بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە[(١)]!

ئەگەر مەزەندەی ئەم بابەتە بکەین، جیهانی فەیسبوك بە ژمارە وەربگرین، یەك ملیار کەس خەریکی فەیسبوکە، وەکوو وڵاتێکی گەورەی وەک چین وەهایە. گرفتەکە لەوەدایە زۆربەی بەکارهێنەرانی لە جیهانی ئیسلامییە. لەبەر ئەوەی جیهانی ئیسلامی بێخاوەنە، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بێ بەرنامە و پڕۆژە و بێستراتیژە و بێئامانجە، بەڵام جیهانی ئەورووپی دەزانن ئامانجیان لە جیهانگیریدا چییە و ئامانجیان لە بەکارهێنانی فەیسبوك و دروستکردنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا چییە و ئامانجی لە غەزووی ڕۆشنبیری و فیکری و کولتووری و بوارەکانی تر چییە. کەواتە ئەوان بەرچاوڕوونن، پێش هەنگاویان دیارە و ئامانجیان لێ دیارە، مەبەستیان دیارە و ڕاستەڕێ و هەنگاوەکانی خۆیان دەستنیشان کردووە.

ئێمە کەوتووینەتە ناو بازنەی هەڵسووڕاندن و گەمە و پڕۆژەی ئەوانەوە، ئەوەی بێپڕۆژەیە و بێئامانج و بێپلان و بێنەخشەڕێگایە و بێستراتیژە، ئەوە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە! ئەوەی کە دەزانێت ئامانج لە بەجیهانگیریکردن چییە؛ ئەوانن، چ جیهانگیریی ئابووری یان ڕۆشنبیری یان فیکری یان کۆمەڵایەتی بێت، چ بە جیهانگیریی تەکنەلۆژیای سەردەم بێت.

دەزانن هەموو ئەو بەجیهانگیریکردنە بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئاڕاستەکەی بۆ

---

(١) بڕوانە: شبكة المعلوماتية النبأ العظيم، حصاد ٢٠١٧، استخدام مواقع التواصل الاجتماعي في العالم العربي. مركز النبأ الوثائقي يقدم الخدمات الوثائقية والمعلوماتية، للاشتراك والاتصال annabaa010@gmail.com، او عبر صفحتنا في الفيسبوك (مركز النبأ لوثائقي).

کێیە؟ ڕوو لە کێ دەکات؟ لە کۆتاییدا بەرهەم و ئامانج و دەستکەوتەکانی چین؟ ئەمە سەرسامبوون و پیاهەڵدانی ئەورووپا نییە، بەڵکوو واقیعێکە، دەبێت دانی پێدا بنێین.

ئەم قۆناغەی کە ئێستا ئێمە تێیداین، هەستیارترین و ترسناکترین قۆناغە لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا، چونکە قۆناغی ململانێ و دژایەتیی یەکترە، قۆناغی ڕەشکردنەوەی یەکترە، قۆناغی سەپاندنی ڕۆشنبیرییە بەسەر یەکتردا، قۆناغی ڕەشکردنەوەی شوناسی یەکترە، قۆناغی ململانێیەکی قووڵی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکری و شارستانییە، قۆناغی ململانێیەکی قووڵی دەستبەسەرداگرتن و قۆرخکارییە لە هەموو بوارەکاندا.

ئایا لە ئێستادا گەنج ئاگای لەم پرۆژە فراوانە هەیە؟ ئاگای لە پاڵنەرەکانی پشتی جیهانگیری هەیە؟ ئاگای لەوەیە کەوتووەتە ناو گەمەیەکەوە و نازانێت لە کوێی گەمەکەدایە؟ ئاگای لەوەیە ئەم پرۆژەیە لەسەر ئەو جێبەجێ دەکرێت؟ ئاگای لەوەیە چۆن سوود لە جیهانگیری وەربگرێت؟ چۆن سوود لە جیهانگیریی بواری ڕۆشنبیری و ئابووری و تەکنەلۆژیا و بواری فیکری و کولتووری وەربگرێت؟

بێگومان دەتوانن سوود وەربگرن، بەڵام نەخێر، هەموویان وا ناکەن، چەند کەسێکیان، کەمێکی زۆر کەمیان نەبێت.

پێویستە لە ڕووی وزە و تواناوە گرنگی بە گەنج بدەین، لە ڕووی نەبوونی بوار و کاتی بێئامانجەوە. پێویستە ئاگامان لە لایەنێکی دیکەی زۆر گرنگی گەنج بێت، ئەویش هەست و سۆز، شوناس و پێناسە و کەسایەتییەتی. گەنج کەسایەتی و شوناس و ڕەوشت و هەڵسوکەوت و ڕەنگ و سیماکەی لەناو جیهانی جیهانگیری نەتوێتەوە. ئەم باسەی پێشوو بۆمان دەردەخات گەنج چەندە گرنگ و پڕبەهایە، بۆیە بڕیارمان داوە کۆڵ نادەین، دێینە سەر ئەوەی تا کەی گەنج لەم ڕۆژگار و سەردەمەدا بەو ناگرنگییە بمێنێتەوە و تا کەی ئاشنا نەکرێت لە چ سەردەمێکدایە، ئەوە کرۆکی یەك یەکی تەوەرەکانمانە.

هەر بندیوارێك و ناو ئۆتۆمبێلێك و ژوورێك و چایخانەیەك و كافێیەك تەماشا بكە، دەبینیت گەنجێك لە قوژبنێكدا بەدیار تۆڕی كۆمەڵایەتییەوە دانیشتووە، دەتوانم بڵێم لە سەددا هەشتا بەرەو سەرەوە ئامانجێكی دیاریكراویان لەو گەڕانەدا نییە و بەدوای بەدەستهێنان و زانیاریدا ناگەڕێن و بەدوای چارەسەری كێشەیەكی خۆیاندا ناگەڕێن. جگە لەوەش، لەگەڵ هەر گەڕان و خۆخەریككردنێكی بێكەڵكدا، دەیان كێشەی تر بۆ خۆی گەڵاڵە دەكات.

گەنج ئەمڕۆ تووشی وێرانی بووە، تووشی ڕووخان بووە، تووشی داڕووخانێكی دەروونیی زۆر گەورە بووە، لە كاتێكدا ئەمڕۆ سەردەم سەردەمی جیهانگیرییە، دەبوو لە جیهانگیریدا گەنج پەرە بسێنێت و بچێتە پێشەوە و هەنگاو بنێت و گەورە ببێت، خواستی هەبێت، ئەمڕۆ گەنج سەرقاڵە بە نەخۆشیی دەروونی و سایكۆلۆژی و فیكری و بەفیڕۆدانی كاتەوە.

جیهانگیری كۆمەڵێك زیان و نەرێنیی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ خۆیدا هێناوە، لەناو ئەوانەدا ئەوەی كە قوربانییە، ئەوەی كە لەناو چووە، ئەوەی كە تواوەتەوە، ئەوەی لەگەڵ شەپۆلەكەدا كەوتووە و ڕایماڵیوە؛ گەنجە.

بێگومان گەنج سەرچاوەی سەرەكیی گۆڕانكارییەكانە، گۆڕانكارییەك لە جیهاندا بكرێت، سەرچاوەكەی لەگەڵ جێپەنجەی گەنجدایە. ئەگەر چاومان لە شارستانیەت و دنیایەكی نوێ بێت، وەكوو ئەوەی ئەورووپا كردوویەتی، دەبێت لە كۆتاییدا گەنج بیكات. ئەگەر چاومان لە پێشكەوتنی هەر بوارێك لە بوارەكانی ژیان بێت، دیسان پێویستمان بە هاوكاریی گەنجە. گەنج هەموو هەنگاوەكان و ئاواتەكانی بەوە سەقامگیر دەڕوات كە ئێمە بیر لەوە بكەینەوە چۆن ژیانی ئەمڕۆی جیهانگیری فەراهەم بكەین، بۆ ئەوەی گەنج بتوانێت پێویستی و داخوازییەكانی خۆی بەرهەم بهێنێت و لەناو ئەم داخوازییانەدا داهێنان و نوێكاری بكات و بەرهەم بهێنێت. لە سەدەی بیستەم تا بیست و یەكەم، دەتوانم بڵێم سەرەتای جیهانگیریی ئەم جیهانەیە، بەتایبەتی لەدوای بەرەو تەواوبوونی فۆرجی (G4)،

دەچینە قۆناغی فایفجی (G5)[1] یەوە، کە ئەو کاتە دنیا زیاتر بچووك دەبێتەوە و جیهانگیری زیاتر دەسەڵاتی دەبێت و جیهان دەبێتە دێیەك و هەمووی سەرقاڵ دەبێت بەوەی کە کاتی کورت دەبێتەوە، زانیارییەکان زۆرتر دەگەنە هاوڵاتییان. ئەوانەی کە ماون و تا ئێستا نەچوونەتە ناو ئەم تۆڕە فراوانەوە کە پێی دەڵێین تۆڕی جیهانگیری، لەوانەیە لە فایفجی هەموویان ڕابکێشێت و بچنەوە ناو ئەم قۆناغە نوێیەوە.

لەولاشەوە کۆمەڵێك بابەتی ترسناك هەن، ئایا فایفجی دەبێتە مایەی ئەوەی کە هەموومان بە ئامێرێک جوولە و ڕۆیشتن و دانیشتن و هەستان و هەموو جووڵەیەکمان وێنە گیرابێت و بەدەست دەزگا هەواڵگرییەکانەوە بێت؟ ئەمەش بابەتێکی ترە و پێویستە قسەی لەسەر بکەین، کە چۆن ئێمە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوەدا بکەین.

گەنج لە ئەمڕۆی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تووشی حاڵەتی داڕووخان بووە، جیهان ئەمڕۆ خۆی بە جیهانگیری ناساندووە، بەڵام ئایا ئەو جیهانگیرییە بۆچی خاڵی ئامانج و ئاڕاستە نەرێنییەکەی بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە؟ بۆچی حاڵەتە تەکنەلۆژی و زانستییەکەی بۆ ئەورووپایە، بەڵام حاڵەتە شکستەکەی و دواکەوتووەکەی و فەراغەکەی ڕووی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە؟ ئەمانە کۆمەڵێك بابەتن بەڕاستی پێویست دەکات زۆر بەوردی لەسەریان بوەستین. لەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەدا گەنج فەلسەفەی پرسیارە فەلسەفییەکانی و تێڕوانینی بۆ بوون و بۆ خوا و بۆ مرۆڤ و دەوروبەر جیاواز بووە و دەبێت جیاواز بێت، ئاگامان لەوە بێت جیهانگیری کاتێك دێتە جیهانی ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، ئەو تێڕوانینانەی تەواو گۆڕی، لە هەر گەنج و هەرزەکارێك بپرسە ئایا تۆ تێڕوانین و خوێندنەوەت لە بۆ بوونەوەر چییە، لەوانەیە بەبێ گومان نەتوانێت وەڵامت بداتەوە، یان ئەگەر وەڵام بداتەوە؛ وەڵامەکانی لەوانەیە زۆر زۆر هەڵە بن، یان بەلای

[1] فایفجی: واتە جیلی پێنجەم، بۆ سیستمێکی نوێی ئەلیکترۆنی بەکار دێت، خێراییەکەی لە یەك چرکەدا ٢٠ مێگابایت دەگوازێتەوە، واتە لە ڕووی گەیاندنەوە لە هەموو جۆرەکان خێراتر کار دەکات.

کەمەوە لەبەری هەڵبێت. ئەمە لەبەر چی وا دەکات؟ لەبەر ئەوەی نازانێت کەوتووەتە ناو جیهان و ڕۆشنبیرییەکی تایبەتەوە، کە ئەم ڕۆشنبیرییە لەگەڵ ڕۆشنبیرییەکەی ئەودا زۆر جیاوازە، لەگەڵ دنیای ڕۆشنبیری و کولتوور و بابەتە فەرهەنگییەکانی ئەو زۆر زۆر جیاوازە.

جیهانگیری جارێکی تر شارستانیەتی ئەورووپیی بە چاك و خراپیەوە هێناوەتە جیهانی ئیسلامییەوە، بەسەر تێڕوانین و دید و کولتوور و ڕۆشنبیریدا زاڵ بووە. شارستانیەتی ئەورووپی هەموو فەرهەنگەکانی خۆی لە خانووبەرە و هەڵسوکەوت و ڕەوشت و سیما و جلوبەرگی، لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانە و چوونە بازاڕ و هاتنەدەری، بگرە هەموو شتەکانی کار دەکاتە سەر فیکر و کولتووری کەسەکانی، هەمووی سەرسامە بە شارستانیەتی ڕۆژئاوا، بەبێ ئەوەی بزانێت کامیان باشە و کامیان خراپە، کامیان لەگەڵ ئەودا دەگونجێت و کامیان ناگونجێت، کامیان بۆ سەر ژیان و شوناسی مەترسیدارە، کامیان بۆ سەر ژیان و شوناسی باشە، کامیان ڕەوشتی ئەوی گۆڕیوە لە باش بۆ خراپ!

ڕاستییەك هەیە کە نابێت لەبیری بکەین، بابەتی گەنج و جیهانگیری کۆمەڵێك پرسیاری بنچینەیین لە مێشکی هەموو تاکێکی گەنجدا دەسووڕێنەوە و وەڵامیان دەداتەوە.

ئەمڕۆ گەنج گیرۆدەیە بە کۆمەڵێك پرسیارەوە، پرسیار لە بارەی جیهانگیرییەوە دەکات، چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات؟ نەرێنییەکانی لەکوێدان؟ ئەرێنییەکانی چۆنن؟ چۆن بتوانین سوودیان لێ وەربگرین؟ ئەو لەکوێی جیهانگیریدایە؟

ئەوانە هەمووی دەبێت لەم کتێبە و زنجیرەبابەتەدا وەڵام بدرێنەوە، تا ئێستا بەشێکی زۆر لە گەنجان وەڵامی دروستیان پێ نییە.

ڕێژەی گەنج لە جیهانی ئیسلامی لە هەرسێ کیشوەرەکەی تر زیاترە، وەك زانایان دەڵێن لە سەددا چوار و چەند پۆینتێك، یان هەندێکیان دەڵێن پێنج و چوار پۆینت لە جیهانی ئیسلامیدا گەنجە، واتە لە سەددا بیست لە دانیشتووانی جیهان گەنجە،

کەواتە جیاوازییەکی زۆرمان لەگەڵ جیهانی ئەورووپی هەیە، بۆ نموونە جیهان بەگشتی وەربگرین، دەڵێین ٥٥,٤% لە جیهان گەنجن. لە جیهانی ئیسلامی یان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگشتی، یان لە دەوڵەتە نامییەکان و تازەپێگەیشتووەکان، دەتوانین بڵێین نیوەی گەنجە، هەندێك ڕێژە دەڵێن لە سەددا شەستی (٦٠%) گەنجە، واتە لە تەمەنی بیست و سێ ساڵی بۆ چل ساڵ، ئەمە بۆ جیهانی ئیسلامی گەنجینەیەکی زۆر گەورەیە.

لە ساڵی ٢٠١١ بەدواوە، نەتەوە یەکگرتووەکان سەرژمێرییەکی کردووە تایبەت بە جیهانی ئیسلامی و جیهانی ئیسلامیی ناو نا جیهانی گەنجان، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ناو نا ڕۆژهەڵاتی گەنجان، ئەمە زۆر گرنگە، واتە تەمەنی ئەوانە لە بیست و سێ ساڵ بۆ چل ساڵن، بێگومان زۆربەیان لە هەندێك وڵاتدا لای سەرووەکەی بیست و سێیە، هەندێکی بیست و شەشە، بەڵام هەتا چل ساڵ کە پێی دەڵێن گەنج، زۆرینەی جیهانی ئیسلامی پێك دەهێنێت[1].

ئەم ڕاستییە پێی دەڵێن حەقیقەتێکی دیمۆگرافی، ئەم حەقیقەتە ئەورووپا زۆر کاری لەسەر کردووە تا بیگۆڕێت و تا ئێستا نەیتوانیوە. ئەم حەقیقەتە کۆمەڵێك پاڵنەری ئایدۆلۆژی و فیکریی هەیە کە کاریگەریی وای کردووە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی زۆرینەکەی گەنج بێت. بە پێی سەرژمێریی نووسینگەی ئەورووپی بۆ بەتەمەنەکان، لە ساڵی ٢٠١٥دا دەڵێت وڵاتانی ئەورووپی کە پێك هاتوون لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و ئیسپانیا تا دەگاتە چیك و سلۆڤاکیا و هەندێك وڵاتی دیکە، ڕێژەی بەتەمەنەکان (٥٥,٣%)یە، واتە لە هەر بیست کەسێك یەکێك بەتەمەنە، تەمەنەکەشی لە چەند؟ لە سەرەوەی ٨٠ ساڵە، بۆیە ئەو پەتا و نەخۆشییەی ئێستا هەیە و پێی دەڵێن ڤایرۆسی کۆرۆنا، زۆرینەی هەرە زۆری قوربانییەکانی خەڵکی ئەورووپییە، چونکە ئەوان تەمەنەکەیان لەسەرووی هەشتا ساڵییەوەیە و زۆرینەی خەڵکیان بەتەمەنە. ژیانی ئیتاڵیا و

---

[1] بڕوانە: فيئة المسنسن في المنطقة العربية الاتجاهات الاحصائية ومنظور السياسات، مجلس وزراء الشئون الاجتماعية العرب. قام المكتب الإقليمي لصندوق ألمم المتحدة للسكان للمنطقة العربية بإعداد هذا التقرير.

ئەڵمانیا و بەریتانیا و بەشێك لە وڵاتانی ئەورووپی؛ وڵاتی پیر و بەساڵاچووانە، واتە قەیرانی گەنجیان هەیە، ئەمانە هەمووی پێمان دەڵێن سامان و هێز و داهێنان و فیکر و ڕۆشنبیری و کولتووری گەورە هەمووی لە جیهانی ئیسلامیدایە. ئەم کەلێنەیان بەوە پڕ کردووەتەوە کە ئامانج و ستراتیژ و پڕۆژە و نەخشەڕێگا و هەنگاوی داهاتوویان لەبەرچاو دیارە، بەڵام ئێمە لێڵ و بێ ئامانج و دنیابینی و ستراتیژ و بێ نەخشەڕێگاین.

لە گەنجێکی جیهانی ئیسلامی بپرسە، بۆت دەردەکەوێت بیرکردنەوە و ئامانجیان زۆر جیاوازە لەگەڵ گەنجێك لە ئەورووپا. ئەورووپییەکە بیر لەوە دەکاتەوە چۆن داهاتووی خۆی و نیشتمانەکەی و داهاتووی تەکنەلۆژیا و داهاتووی ڕۆشنبیری بەرەو پێش ببات، چۆن بتوانێت ئەو غەزووە فیکرییەی کە لەلای خۆی هەیە، نەك هەر لە وڵاتی خۆی بەرجەستەی بکات، بەڵکوو بۆ جیهانی ئیسلامی و تاکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بگوازێتەوە. ئەو تەکنەلۆژیایەی کە هەیەتی، لەگەڵ گەورەترین دەوڵەت ململانێی پێ بکات. چین وڵاتێکی کۆنفۆشیۆسییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیر لەوە دەکاتەوە بێت و لە جیهانی ئیسلامیدا بیری خۆی و شیوعیەت بڵاو بکاتەوە. ئێمە لە وڵاتەکەی خۆمان بێئامانجین و نازانین چی دەکەین، ئینتیمای نیشتمانیمان لاوازە و ئینتیمای گەنجایەتیمان لاوازە، ئینتیمامان بۆ مرۆڤ و بۆ دەوروبەرمان لاوازە.

## گەنجان کێن؟

گەنجێتی قۆناغێکە لە قۆناغەکانی تەمەن کە مرۆڤ پیایدا تێپەڕ دەبێت، لە ١٥ ساڵییەوە دەست پێ دەکات و لە ٤٠ ساڵی کۆتایی دێت، چونکە گەشەی تەمەنی مرۆڤ لە ٤٠ ساڵیدا تەواو دەبێت. بۆیە وشەی "الشباب" لە زمانەوانیدا بە واتای گەشە (نما) و هێز (قوه) لێك دراوەتەوە، خودای گەورەش لە بارەیەوە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١٣﴾ (الأحقاف: ١٣)، واتە: "هەتا کاتێك مرۆڤ دەگاتە حاڵەتی توندوتۆڵی و توانایی و تەمەنی ٤٠ ساڵی." هەروەها "ئیبن کەسیر" دەفەرموویێت: "تناهی عقله وکمل فهمه"، واتە: "تەواوی عەقڵ و تێگەیشتن".

## گرنگیی قۆناغی گەنجایەتی

ئەم قۆناغە لە تەمەن بە گرنگترین قۆناغ دادەنرێت، لەبەر ئەم هۆیانە:

#### یەکەم: تەمەنی هێز و بەرهەمهێنانە

مرۆڤ لە درێژەی ژیانیدا بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت، قۆناغەکانیش جیاوازن، سەرەتا دێتە دنیاوە بچووك و بێهێز و نەزانە، دواتر گەورە دەبێت و گەشە دەکات، هێز و زانستی زیاد دەبێت. ﴿وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٧٨﴾ (النحل: ٧٨)، واتە: "خودای گەورە بەندەکان لەناو سکی دایکان دەردەهێنێت و هیچ نازانن،

گوێیان پێ دەدات بۆ بیستن، چاویان پێ دەدات بۆ بینین، عەقڵیان پێ دەدات بۆ جیاکردنەوەی باش و خراپ لە یەکتر، بەڵام قۆناغی گەنجێتی درێژە ناخایەنێت، بەڵکوو بەرەو بێهێزی دەچێتەوە"، هەروەکوو خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ ﴾ (الروم: ٥٤) ، واتە: "خوا ئەو زاتەیە ئێوەی بە لاوازی دروست کردووە (سەرەتا نوتفەیەکی لاواز، دوایی وەك دیل لە سکی دایکدا، پاشان هەر منداڵی لاوازیت تا دەگەیتە تەمەنی لاوی)، ئەوسا خوا هێز و دەسەڵاتێکت پێ دەبەخشێت، دوای هێز و توانایی دووبارە نۆرەی لاوازی و پیری دێت، بێگومان ئەو خوایە هەر چیی بوێت دروستی دەکات (ئەم هێز و بێهێزییە بەشێکە لە ویستی ئەو زاتە)، ئەو پەروەردگارە زانا و بەتوانایە."

**دووەم: چاکترین قۆناغی تەمەنە**

ئـەم قۆناغـە چونکـە قۆنـاغی هێـز و گەشـەیە، زیـاتر چێـژی پێـوە بەنـدە، خۆشییەکان زیاتر لەم قۆناغەدا تام دەکرێن و هـەوڵیان بـۆ دەدرێت، بچـووك هیـوای گەنجێتی دەخوازێت و پیریش خۆزگەی بۆ دەخوازێت. بۆیە خودای گـەورەش کاتێك پاداشتی بەهەشتییەکان دەداتـەوە، باوەڕداران دێنـە سـەر تەمـەنی گـەنجێتی کـە ٣٣ ساڵە و هیچ کەس لە قۆناغی پیری و منداڵیدا نامێنێت.

**سێیەم: تەمەنی مرۆڤ**

وەك پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر) دەفـەرمووێت: "أَعْـمَارُ أُمَّتِـي مَـا بَـيْنَ السِّتِّينَ إِلَى السَّـبْعِينَ، وَأَقَلُّهُـمْ مَـنْ يَجُـوزُ ذَلِـكَ[١]"، واتـە: "تەمـەنی ئوممـەتی مـن

[١] اخرجه الترمذي في سننة.

لەنێوان شەست تا حەفتا ساڵە، کەمێکیان لەوە تێدەپەڕن." کەواتە تەمەنی منداڵی دەست پێ دەکات لە لەدایکبوونەوە تا دەگاتە ١٤ ساڵی، تەمەنی گەنجێتی لە ١٥ ساڵی تا دەگاتە ٤٠ ساڵی و تەمەنی جوامێری (کهولە) لە ٤١ ساڵی تا دەگاتە ٥٠ ساڵی و تەمەنی پیر و پەککەوتە لە ٥٠ ساڵی تا دەگاتە مردن. تەمەنی گەنج زۆرترین و درێژترین بەشی بەر کەوتووە لە تەمەن کە دەکاتە ٢٥ ساڵ.

| قۆناغ | ساڵەکانی تەمەن | ڕێژەی تەمەن بە سەدی |
|---|---|---|
| منداڵی | (لەدایکبوون-١٤) ساڵی | %٢٢ |
| گەنجیەتی | لە (١٥-٤٠) ساڵی | %٤٠ |
| جوامێر (کهولة) | لە (٤١-٥٠) ساڵی | %١٥ |
| بەساڵاچوو (شیخوخة) | لە (٥١ ساڵی-مردنی) | %٢٣ |

ئەم شێوازە دابەشکردنەی تەمەن زیاتر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەدی دەکرێت.

تێبینی: نەتەوە یەکگرتووەکان بەو شێوەیە پێناسەی گەنج دەکەن: ئەو کەسانەی کە تەمەنیان لەنێوان ١٥ بۆ ٢٤ ساڵدایە.

## چوارەم: گەنجان کۆڵەکەی هەموو گەلێکن

گەنجان لە سەرتاسەری جیهاندا کۆڵەکەی پێشکەوتن و شارستانیەتن، سەرچاوەی بەخشین و خۆبەختکردن و هاوکارین. زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان کە مێژوویەکی پرشنگداریان تۆمار کردووە، ڕێژەی گەنجانیان زۆرە.

## پێناسەی گەنج

زۆر پێناسە بۆ گەنج کراوە، بەڵام بە پێی پێویست نین، چونکە گەنجی کارلێکێکی ئاڵۆزە لە هۆکارە جەستەیی و دەروونی و سۆزداری و کۆمەڵایەتییەکان کە کاریگەریی لەسەر تەواوی کەسایەتی هەیە. تایبەتمەندیی گشتی هەن کە بە هەموو بەشەکانی تەمەنی گەنجیدا تێدەپەڕن، سەرەتا وەك منداڵی، ناوەڕاست، هەرزەکاری، گەنج، پێگەیشتوو، پیر. کەواتە گەنج لە شوێنێك بۆ شوێنێك، لە وڵاتێك بۆ وڵاتێك، لە تاکێك بۆ تاکێك، گەنج پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە، بەڵام دەکرێت بەم شێوەی خوارەوە پۆلێنی بکەین.

## گەنج کێیە؟

سەرەتا بۆ ئەوەی گەنج بناسێنین، دەبێت پێناسەیەکی هەنووکەیی سەردەمیانەی بۆ بکەین، چونکە پێناسی گەنج دینامیکییە، واتە بەردەوام لە گۆڕاندایە، هۆکارەکەشی ئەوەیە دنیا چ لە ڕوانگەی تەکنەلۆژیاوە، چ لە ڕوانگەی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ژینگەییەوە بەردەوام لە گۆڕاندان، ئەو گۆڕانەش ڕاستەوخۆ پێش هەموو تەمەنەکان بەر گەنج دەکەوێت، کەواتە گەنج بە پێی سەردەم، شوێنی جوگرافی، کولتووری، ئاستی کۆمەڵگا و ژینگەیی و سیاسی و ئایینی پێناسی لە گۆڕاندایە.

## گەنج لە ڕوانگەی جەستەییەوە

گەنج لە ڕوانگەی جەستەییەوە پێناسەکەی دەکەوێتە نێوان سێگۆشەی منداڵی و پیرییەوە، واتە ئەو کاتەی منداڵی هێزەکانی دەگاتە لوتکەی سێگۆشەکە، گەنجی لەو لوتکەیەدا دەمێنێتەوە، تا ئەو ڕۆژەی لە لوتکەی سێگۆشەکە دێتە

خوارەوە گەنجی کۆتایی پێ دێت و بەرەو پیری دەچێت. واتە ئەو ڕۆژە منداڵی کۆتایی پێ دێت کە گەنجی دەست پێ دەکات. ئەو ڕۆژەی کە پیری دەست پێ دەکات، لە ڕوانگەی هێزی جەستەییەوە گەشەی جەستەی دەوەستێت و دادەبەزێت، ئەوەش لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر گۆڕانکاریی بەسەردا دێت، بۆ نموونە هەندێك وڵات گەنجی لە تەمەنی سیازدەساڵی دەست پێ دەکات و تا ٤٠ ساڵی دەمێنێتەوە، وڵاتەکانی وەك فلیپین و تایلەند و ژاپۆن گەنجانیان بەو شێوەیەیە. بەشێکی تر لە سیازدە ساڵی دەست پێ دەکات تا ٣٠ ساڵ، وەك وڵاتە ئەوروپییەکان. کەمترینیان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە کە گەنجی لە ١٣ ساڵی دەست پێ دەکات و تا ٢٣ ساڵ دەمێنێتەوە. ئەو شێوازە تەمەنە پەیوەستە بە ژینگەی پاك، خواردنی تەندروست و بۆماوەیی، وەرزش و جووڵەکانی لەش، ڕاگرتنی هاوسەنگیی تەندروستی، گرنگیدان بە لایەنی ڕۆحی وەك عیبادەت و خواپەرستی، کۆمەڵێك ڕاهێنانی وەك بیرکردنەوە لە بابەتە قووڵە فەلسەفییەکان. بۆیە پێناسەی گەنج لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. نەتەوە یەکگرتووەکان پێناسەی گەنجی کردووە بە ڕەچاوکردنی هاوسەنگی لەو وڵاتانەی کە جیاوازی و پێناسەی گەنجیان تێدایە، ئەو کەسانەی کە تەمەنیان لەنێوان ١٥ بۆ ٢٤ساڵدایە، بەڵام بە شێوە ستانداردەکە نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێت هەر کەسێك لەخوار تەمەنی هەژدە ساڵەوە بێت، بە منداڵ هەژمار دەکرێت.

هیچ پێناسەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر تەمەنی گەنجان لەسەر ئاستی گشتگیر نییە، بەڵام بۆ مەبەستی ئاماری، نەتەوە یەکگرتووەکان -بەبێ ئەوەی ڕەچاوی هیچ پێناسەیەکی دیکە بکات کە لەلایەن وڵاتانی ئەندامەوە کراوە- گەنجان بەو کەسانە پێناسە دەکات کە تەمەنیان لەنێوان ١٥ بۆ ٢٤ ساڵدایە. ئەم پێناسەیە کە لە چوارچێوەی ئامادەکارییەکان بۆ ساڵی نێودەوڵەتیی لاوان (١٩٨٥) سەری هەڵدا (بڕوانە: A/36/215)، لەلایەن کۆبوونەوەی گشتییەوە لە بڕیارنامەی ٢٨/٣٦ی ساڵی ١٩٨١دا پشتڕاست کرایەوە. هەموو ئامارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە گەنجان لەسەر بنەمای ئەم پێناسەیەیە وەك لە ساڵنامەی ئامارەکاندا ڕەنگ دەداتەوە، کە لەلایەن سیستمی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە سەبارەت بە دیمۆگرافیا،

پەروەردە، دامەزراندن و تەندروستی بڵاو دەكرێتەوە. ئەم پێناسە ئامارییە بۆ گەنجان، لە بەرانبەردا بەو واتایەیە كە منداڵان بەو كەسانە دادەنرێن كە تەمەنیان لەخوار ١٤ ساڵەوەیە. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە كە مادەی یەكەمی ڕێككەوتننامەی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ مافەكانی منداڵان، منداڵان وەك كەسەكان پێناسە دەكات، لەو كاتەدا هیوا دەخوازرا كە ڕێككەوتننامەكە پاراستنی مافەكان بۆ گرووپێكی تەمەنی گەورە دابین بكات، بەتایبەت كە هیچ بەڵگەنامەیەكی هاوشێوە سەبارەت بە مافەكانی گەنجان نەبوو. هەروەها زۆرێك لە وڵاتان هێڵەكە لەسەر گەنجان دەكێشن سەبارەت بەو تەمەنەی كە كەسێك بە پێی یاسا مامەڵەی یەكسانی لەگەڵ دەكرێت و زۆر جار بە تەمەنی زۆرینە ناو دەبرێت.

ئەم تەمەنە بە شێوەیەكی باو لە زۆرێك لە وڵاتان ١٨ ساڵە، بە جۆرێك كە مرۆڤ كاتێك دەگاتە ئەم تەمەنە، بە كەسێكی گەورە دادەنرێت. سەرەڕای ئەوەش، پێناسەی كاركردن و توانستەكانی گەنجان لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر دەگۆڕێت، بە پێی هۆكارە ڕێژەییەكانی كۆمەڵایەتی و كولتووری، دامەزراوەیی، ئابووری و سیاسی.

## گەنج لە ڕوانگەی عەقڵییەوە

گەنج چۆن لە ڕوانگەی هێزەوە لە لوتكەدایە، لە ڕوانگەی عەقڵییەوە بە نوێترین و سەردەمیترین ئامێر و تەكنەلۆژیا و ژینگە بە شێوەیەكی ئاسان بارگاوی دەبێت، كەواتە گەنج هەڵگری نوێترین داهێنان دەبێت بە شێوەیەكی ئاسانتر لە منداڵ و پیر، بە شێوەیەكی خێراتر، چونكە ڕێڕەوی هاوتەریب لەگەڵ گۆڕانكارییەكان دەڕوات، ئەوەش بە هۆی ئەزموونی منداڵی و كاریگەرییە ژینگەیی، كۆمەڵایەتی، ئایینییەكان و كولتوورییەكانەوە دەبێت. بۆ منداڵێك گۆڕانكاری سەختە، چونكە منداڵ تەنها وێنەكان كاریگەریی لەسەر دادەنێن، هەروەها پیرەكان بە ئەزموون زیاتر شت فێر دەبن، بەڵام گەنج بە پێشڕەوی و خۆدانەپێش و خێراكردن دەبێتە پێشەنگی گۆڕانكارییە عەقڵییەكان. هەموو ئەو

پێشکەوتنە تەکنەلۆژیا و زانیارییانە کە دروست دەبێت، گەنج بەرکەوتەی یەکەم دەبێت. کاتێك لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا ئاوێتە دەبێت و بەرکەوتەی دەبێت، تیشکدانەوەکەی زۆر بەهێز دەبێت لەناو کۆمەڵگا، بۆیە زۆر جار گەنج بە هەلپەرست و پەلەپەل لەقەڵەم دەدەن، ئەوەش گەشەیەکی سروشتییە بۆ گەنجان، چونکە گەنج گەنجە، پیر نییە و منداڵ نییە، شێوازی بیرکردنەوە و کارکردنی جیاوازە، بۆیە ڕەنگدانەوەکانیشی جیاوازە لەناو کۆمەڵگا.

## گەنج و داهێنان و هێزی کار

هەموو وڵاتە دواکەوتوو و پێشکەوتووەکان، پشت بە توانای مرۆیی گەنج دەبەستن لە هێزی کار. گەنج بڕبڕەی پشتی هەر وڵاتێکە، کە وڵاتێکی کشتوکاڵی یان وڵاتێکی پیشەسازی، یان وڵاتێکی تەکنەلۆژی بێت. گەنج بڕبڕەی پشتی هێزی کارە بەبێ جیاوازیی وڵاتان. کەواتە گەنج سەرچاوەی داهێنان، کار، وزە، پێشکەوتن و ژێرخانی مرۆیی هەو وڵات و ناوچەیەکە.

## گەنج و گۆڕانکاری

گەنج بەو توانا جەستەیی و عەقڵییەی کە هەیەتی، زۆر جار ڕازی نابێت بە کارە بۆماوەییەکان، بۆیە دێت لەبەر چەند بنەمایەك گۆڕانکاری دروست دەکات، چونکە ئەم گەنجە خودای گەورە بۆ سەردەمی خۆی دروستی کردووە. گەنج دێت و دەستکاریی پرس و چەمك و ڕێباز و ڕێڕەو و شێوازەکانی ژیان دەکات، یان دێت داهێنان دەکات، کارێك ئەنجام دەدات کە لەپێش خۆی نەبووە، یان دەستکاری و گۆڕانکاری ئەنجام دەدات. بۆ نموونە نووسینی ئەم کتێبە بەشێکە لە ڕازینەبوون لە کاری ڕابردوو، یان داهێنانێك لە داهاتوو، یان جوانکارییەك لە سیستمی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئایینی، کولتووری و سیاسی، ئەوەش لەوەتەی مێژوو هەیە ژیان بەو شێوازە ماوەتەوە، کە چۆن ئەم مرۆڤە بۆ سەردەمی خۆی؛ خۆی بە گۆڕانکارییەکانی دەگونجێنێت.

# پلەوپایەی گەنجان لە ئیسلامدا

### گەنجان لە قورئاندا

قورئان پڕە لە هەڵوێستی ئەو گەنجانەی کە لە ڕێی ئایینی خودا ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ ستەمکار و زۆرداری سەردەم ئەنجام داوە، وەك پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر) کە بتەکان دەشکێنێت. هەروەکوو خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٥٩ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۝٦٠﴾ (الأنبياء: ٥٩–٦٠)، واتە: "بتپەرستان (کە هاتنەوە بینییان بتەکانیان وردوخاش کراوە) گوتیان: ئەوەی ئەمەی کردووە بە خواکانمان، بەڕاستی لە ستەمکارانە، هەندێکیان گوتیان: بیستوومانە لاوێك بە خراپە باسیان دەکات، پێی دەڵێن ئیبراهیم."

هەروەها خودای گەورە باسی کۆمەڵێك گەنجمان بۆ دەکات کە چۆن بەرانبەر گەورەترین زۆردار و دەسەڵاتداری ئەو سەردەمە وەستاون و وشەی حەق و یەکتایی خودای گەورەیان لەبەر چاوی زۆرینەی خەڵك ڕاگەیاندووە، ئەمانیش گەنج بوون، وەك دەفەرمووێت: ﴿نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ۝١٣ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ۝١٤﴾ (الکهف: ١٣ – ١٤)، واتە: "ئێمە بە ڕاستی و دروستی هەواڵی بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بۆ دەگێڕینەوە، بەڕاستی ئەوانە لاوانێك بوون باوەڕی دامەزراویان بە پەروەردگاریان هێنابوو، ئێمەش زیاتر لە نووری باوەڕ و هیدایەت بەهرەوەرمان کردن. ئێمەش دڵەکانیانمان دامەزراو کرد و ترسمان تێدا نەهێشت (بڕیاریان دا کۆمەڵگەی نەفامی بەجێ بهێڵن)، کاتێك هەستان و وتیان:

پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، هەرگیز هانا و هاوار بۆ هیچ خوایەکی تر نابەین جگە لەو، ئەگەر لەو ڕاستییە لا بدەین، سوێند بە خوا ئەوە بێگومان ئێمە لەو کاتەدا قسەی نابەجێ و نادروستمان کردووە."

**گەنجان لە فەرموودەی پێغەمبەردا**

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) گرنگییەکی زۆری بە گەنجان داوە، لە هەموو لایەنەکانەوە هانی داون، لە چەندین فەرموودەدا فەزڵی ئەوانی ختسووەتە ڕوو، وەك دەفەرمووێت: " **إنَّ اللَّه لَيَعجَبُ منَ الشابِّ ليست له صَبْوةٌ**[١]"، واتە: "خودای گەورە بە گەنجێك سەرسامە کە لە گەنجێتیدا هەڵەی نەکردبێت." هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) گەنجان هان دەدات بۆ بەدەستهێنانی باشترین پلە لە مەیدانی مەحشەر و دەفەرمووێت: " **سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ في ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إلاَّ ظِلُّهُ** "، یەك لەوانە " **شابٌّ نَشَأَ في عِبَادَةِ اللَّه**" (رواه الشيخان)، واتە: "حەوت کۆمەڵ هەن لە ڕۆژی دواییدا لەژێر عەرشی خوا ڕادەوستن، یەکێك لەم کۆمەڵانە گەنجانێکن ژیانی خۆیان بە خواپەرستی بەسەر بردووە."

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) گەنجان بۆ ئامادەکردنی خۆیان لە ڕووی جەستە و عەقڵ و ڕەوشتەوە بانگ دەکات کە ئەم کاتانە بە گرنگ وەربگرێت، وەك دەفەرمووێت: "**اغتنِمْ خمسًا قبل خمسٍ: شبابَك قبل هَرَمِك، وصحَّتَك قبل سَقَمِك، وغناك قبل فقرِك، وفراغَك قبل شُغلِك، وحياتَك قبل موتِك**[٢]"، واتە: "گەنجێتییەك بە دەستکەوت بزانە، پێش ئەوەی پیری ڕێت پێ بگرێت نەتوانیت ئەم دەستکەوتە بەدەست بهێنیت." هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) گەنجان ئاگادار بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە دەکاتەوە لەبەرانبەر پەروەردگاری جیهانیان، وەك دەفەرمووێت: "**لا تَزُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَدَمَا عَبْدٍ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعٍ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ**

[١] رواه احمد و ابو يعلي.
[٢] رواه الحاكم.

وَعَنْ جَسَدِه فِيمَا أَبْلاهُ وَعَنْ عِلْمِه مَاذَا عَمِلَ فِيهِ وَعَنْ مَالِه مِنْ أَيْنَ أَخَذَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ ، وعَنْ عِلْمِهِ مَا عَمِلَ فِيهِ[1]"، واتە: "بەندە لە ڕۆژی دواییدا پێیەکانی هەنگاو ناهاوێژێت تا لە چوار شت لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەکرێت، تەمەنت لە چیدا بەسەر برد، لێپرسینەوە لە تەمەنی گەنجی، لە دنیادا بە چیت بەسەر برد، چۆنت بەسەر برد، بۆ ئیسلام یان ڕازیکردنی هەواوهەوەسی خۆت، هەروەها ماڵەکەت چۆن بەدەست هێنا و لە چیدا خەرجت کرد."

ئەی گەنج! ئەوەت لەبیر نەچێت پێغەمبەران کە هاتوون گەنج بوون و توانییان ڕێڕەوی جیهان بگۆڕن، وە بەشی زۆری ئەوانەی سەرەتا باوەڕیان بە پێغەمبەران هێناوە گەنج بوون: ئەبوبەکر کە باوەڕی هێنا؛ **٣٧**ساڵ بوو، عومەر **٢٧** ساڵ و عوسمان بچووکتر و عەلی لەو بچووکتر، عەبدوڵای کوڕی مەسعوود و تەڵحە و زوبێر و سەعد و سەعید و بیلال و سوهەیب و عەمار و ئەرقەم، هەموویان گەنج بوون.

ئەی گەنج! بە **٣٥** ساڵی خەلافەتی ڕاشیدین، لەسەر شانی ئەم گەنجانە ئاڵای ئیسلام لە ڕۆم و فارس و شام و عێراق و میسر و تەرابلووس و باکووری ئەفەریقا هەڵکرا. لە سەردەمی ئومەوییەکاندا، لەسەر دەستی گەنجان زۆربەی وڵاتی هیند و تورکستان و ڕۆژهەڵاتی چین و ڕۆژئاوای ئەندەلوسیا ئاڵای ئیسلامی لێ هەڵکرا. ئەوە عوقبەی کوڕی نافیعە و گەنجێکە کە ئیسلامی گەیاندە زەریای ئەتڵەسی و لەوێوە گەیشتە سەر زەریا، فەرمووی: "اللهم رب محمد لولا هذا البحر لفتحت الدنيا في سبيل اعلاء كلمتك، اللهم فاشهد"، واتە: "ئەی خوایە، ئەگەر ئەم بەحرە نەدەبوو، دنیام لە پێناوی بەرزکردنەوەی وشەی 'لاالة الا الله' ئازاد دەکرد. خودایە، شاهید بە!"

---

[1] رواه الترمذي.

## تەوەری دووەم: گەنجە بەهرەدارەکان

گەنج واتە وزە و توانا و بەهرە، واتە داهێنان و خزمەت و هێز، زیرەکی و دانایی و هۆشیاری، هەموو ئەوانە پێناسە و تایبەتمەندین بۆ گەنج، پێکهاتە و ناوازەیین بۆ گەنج، بۆیە ئەی گەنج، جیهانگیری و بەرهەمەکانی ئاسانکاریی زۆری بۆ تۆ هێناوە، نابێت خۆت فەرامۆش بکەیت و پشتی لێ بکەیت و لەم جیهانگیرییە بێئاگا بیت.

ئەو گەنجانەی بەهرەدارن، ئایا لە جیهانی جیهانگیریدا چی بکەن؟ کاتێك دەڵێین بەهرەدار، واتە گەنجێك خاوەنی وزە و توانا و عەقڵ و هێز و دانایی و زیرەکی و لەبەرکردن و زەین و چالاکی و جووڵە و داهێنان و هەنگاونانە.

ئەم هەموو پیاهەڵدان و پێناسەیە بۆ چییە، بۆ ئەوەیە پێت بڵێم ئەی گەنج، چواردەورت هەمووی دەرفەتە و بۆ تۆ ڕەخساوە، تاوەکوو خۆت ببینیتەوە و بزانیت تۆ کەسێکی بەهرەداریت و دەرفەتێکی باشیش بۆ تۆ ڕەخساوە جێپەنجەی خۆت دیاری بکەیت، چونکە سروشتی سایکۆلۆژیی تاك وایە، ئەگەر کەسێك وزەیەکی پزیشکیی هەبێت و بەکاری نەهێنێت و خەرجی نەکات، هەست دەکات بەردەوام دەروونی ماندووە، کەسێك وزەیەکی ڕاگەیاندنی هەبێت و ڕاگەیاندنکاری نەکات و بەکاری نەهێنێت، بەردەوام لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە دەروونێکی زۆر ماندووی هەیە، کەسێك وزەیەکی تەکنەلۆژیی هەبێت و خەرجی نەکات، بەردەوام هەست بە ماندووبوونێکی زۆر دەکات.

گەنجی بەهرەدار کێیە؟ کورتترین پێناسەی گەنجی بەهرەدار، وێنای گەنجێکمان بۆ دەکات کە خاوەنی توانا و جووڵە و ژیری و داهێنان و زیرەکی و تێگەیشتن و فیکری ڕۆشنە، خاوەنی هیممەتە و هەوڵی داهێنان دەدات. بە گەنجێك دەگوترێت کە چاوەڕێی زیرەکی و توانا و بەهرە و ئەخلاق و هەڵسوکەوتی جیاوازی لی دەکەیت، وێنای کەسێکی پڕ لە ئومێد و داهاتوویەکی گەشی لی دەخوازیت. زیرەکییان

لە خەڵکی تر زیاترە، لە هەر شوێنێك بن دیار و بەرچاون، جێی ئومێدی خەڵك و دەوروبەرن، لە عەقڵ و بیرکردنەوە و وزە و توانا و چالاکی و ئومێدیشدا بەتەواوی لەگەڵ دەوروبەر و دۆست و هاوتەمەنەکانیاندا جیا دەکرێنەوە.

لەبەر ئەم هۆکارانە پێویستە لەسەرمان دەرفەت بۆ گەنجانی بەهرەدار بڕەخسێنین، بیانکەینە پێشەنگ، لەناو کۆمەڵگادا دەریانبخەین، هەموو ئامرازێکی سەرکەوتن و پێشکەوتنیان بۆ فەراهەم بکەین، پشتیان بگرین، بەتایبەتی ئەمڕۆ، چونکە لە جیهانی ئێمەدا تەواوی بوارەکان بەسەر گەنجاندا داخراوە و گەنج ناتوانێت وەکوو پێویست هەنگاو بنێت.

## دیارترین سیما و ئاکار و ڕەوشت و کەسایەتیی گەنجی بەهرەدار چین؟

یەکەم: ڕەوشت و هەڵسوکەوتی گەنجی بەهرەدار بەتەواوی لەگەڵ هاوتەمەن و هاوپیشەکانیدا جیاوازە.

دووەم: خێزان و دایك و باوکی گەنجی بەهرەدار و دەوروبەری بە هەمان شێوە لە بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و ڕەوشت و ئامانجیاندا زۆر جیاوازن، ئەو کەسانەن کە خەڵکی بەهرەداریان لێ پەیدا بووە، جۆرێك لە بۆماوەیی و لە حاڵەتی سایکۆلۆژییان تێدا بەدی دەکرێت.

سێیەم: لە پۆلەکانی خوێندندا لە پلە و هەڵسوکەوتدا زۆر لەپێشە. بۆیە لە زانکۆکان و کۆلێژەکاندا سەیر بکە، مامۆستا باشتر دەتوانێت ئەو گەنجانە ببینێتەوە و بیاندۆزێتەوە کە بەهرەدارن و هەڵبەت لەوێدا بەگشتی بوار و دەرفەت نەڕەخساوە بۆ ئەوەی ئەو بەهرەی خۆی دەربخات. بە هەمان شێوە مامۆستای ئایینی لە مزگەوتدا دەتوانێت ئەو کەسانەی کە بەهرەدارن، لەوێ دەستنیشانیان بکات و بیانبینێتەوە.

چوارەم: ئەو کەسە ڕەفتاری داهێنان و سەرکردەیی تێدایە، واتە بە سروشتی خۆی سەرکردەیە. بۆ نموونە: لە حاڵەتی گۆڕەپانێکی تۆپی پێدا سەرکردانە دەردەکەوێت، یان لەناو کۆمەڵێک خەڵك و خزم و کەسەکانی خۆی لە بۆنەیەکدا کۆ بوونەتەوە، تەماشا دەکەیت ئەو ئیدارەی بابەتەکان دەکات.

پێنجەم: لە کارکردن و پیشەی ڕۆژانەیدا بۆت دەردەکەوێت زۆر دەستڕەنگینە، ئینجا لە بوارێك لە بوارەکانی تردا لەوانەیە بواری پیشەسازی، یان کشتوکاڵی، یان بوارەکانی تر بێت، دەبینیت بەهرەدارە.

شەشەم: یان لە سەرقاڵبوونی بە بابەتی میکانیکییەوە. بۆ نموونە: هەرکە

دەست بە کۆمپیوتەرەکەی یان مۆبایلەکەیدا دەنێت، بۆت دەردەکەوێت ئەم کەسە لە دووتوێی کارکردن پێی، دەیان بەرنامەی تری مومارەسە کردووە بەبێ ئەوەی پێشتر لێی زانیبێت، بەڵام چووەتە پێشەوە و زانیاریی باشی پەیدا کردووە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە بەهرەدارێکی کارایە. یان دەبینیت مۆبایلێکی زۆر سادەی هەیە، بەڵام دەیان داهێنانی لەناو مۆبایلەکەیدا کردووە. ئەگەر ئەو کەسە بە یەك مۆبایلی ئاوا کە لەوانەیە تایبەتمەندییشی نەبێت، بەڵام دەیان نوێکاریی کردبێت، کەواتە ئەگەر کارگەی بۆ فەراهەم بکەیت، کۆمپانیای بۆ دەستەبەر بکەیت، ماددە لەبەر دەستی دابنێیت، واتە ئەم بابەتانەی بۆ پڕ بکەیتەوە، بێگومان زۆر زۆر زیاتر هەنگاو دەنێت و دەچێتە پێشەوە.

حەوتەم: ئاستی لێوەشاوەیی مێشکی، واتە لە ڕووی بیرکردنەوە و لەبەرکردن و وەرگرتن و تێگەیشتن و وردەکاریی ئەم بابەتەوە.

بەم خاڵانە دەتوانین گەنجی بەهرەمەند دەستنیشان بکەین و بیاندۆزینەوە، تا دەرفەتیان بۆ بڕەخسێنین و بیانکەینە پێشەنگ و خزمەتیان بکەین.

بۆ نموونە: بەریقدار گەنجێکی تورکە، توانیی بە بەهرەکەی خۆی فڕۆکەی بێفڕۆکەوان بۆ وڵاتەکەی دروست بکات، ئێستا وڵاتانی ئەورووپی و ڕووسیا و تەنانەت وڵاتی ئۆکرانیا پێویستیان بەم فڕۆکەیەیە، بەشێك لە بەرگریی بەهێزی ئۆکرانیا بەرانبەر ڕووسیا بە فڕۆکەی بەریقدار بووە.

زانایان لە باسی زیرەکیدا دەڵێن وڵاتانی خۆرئاوا زۆر پێداگری لەسەر پێوەر دەکەن، دەڵێن ئەو کەسانەی کە زیرەکییان بەهێزە، لە سەد و سی و پێنج بەسەرەوەن، ئیعتیباریان بۆ دەکرێت کە ژینگەی زیرەکییان زۆر زۆر بەهێزە.

هەشتەم: لە قۆناغی سەرەتای ژیانیدا داهێنانی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر قوتابی بێت، هێشتا لە قۆناغی زانکۆدایە، بەڵام کۆمەڵێک داهێنانی کردووە، کۆمەڵێك شتی نوێی کردووە لە بواری ئەندازیاری، یان لە بواری هونەردا، یان لە بواری

وێنەکێشان، یان لە بواری نووسین و خەتخۆشیدا، یان لە بوارەکانی تردا[١].

کەواتە ئەو کەسانەی کە بەهرە و توانایان هەیە، بواریان بۆ بڕەخسێنین بچنە پێشەوە لە دامودەزگا و دامەزراوەکان، لە حیزب، لە کۆمەڵگا، لە خێزان و لە قوتابخانە، لە مزگەوتەکاندا. ئەگەر بواریان پێ نەدرێت و قۆرخکارییان لەگەڵدا بکرێت، ئەوە بێگومان لە ڕووە ئایینییەکەوە لێپرسینەوەی لەسەرە و گوناحی دەگات، ئەوە بەشێکە لە قۆرخکاری و لە ڕووی ویژدانییشەوە بەڕاستی ئەوە پێچەوانەی ویژدانی خۆی هەوڵ دەدات و پێچەوانەی ویژدانی خۆی هەنگاو دەنێت. بۆیە تاوانە کەسێك بەو ئاڕاستەیە وزەی گەنج و خەڵکی بەتوانا بکوژێت، بەڵکوو بەپێچەوانەوە دەبێت وزەیەکی زیاتریان پێ بدات.

## لە دنیای جیهانگیریدا ئێمە چۆن بەهرەمەندەکان بدۆزینەوە؟

کۆمەڵێك تایبەتمەندیی گشتییان تێدایە. لە جەستەیان ڕابمێنیت تا دەگاتە عەقڵ و بیرکردنەوەیان، خاوەنی لەشولارێکی پتەو و بەهێزن، ڕێکوپێك دەردەکەون، خاوەنی کەسایەتیی زۆر تایبەتن، بەردەوام لە خودی خۆیاندا هەست دەکەن ئاست و پلەیان لەگەڵ خەڵکی تر جیاوازە بۆ ئەوەی ببنە سەرکردە یان ببنە کەسی داهێنەر. لە هەندێك لە توێژینەوەکاندا کە کراوە، بەتایبەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەسێك کردوویەتی بە ناوی لۆیسەوە، دەڵێت ئەم توێژینەوەیە سی و پێنج ساڵی خایاندووە، لەو سی و پێنج ساڵە بۆمان دەرکەوتووە لە ١٥٢٨ کەس، بەشی هەرە زۆریان لە ڕووی لەش و پێکهاتەیانەوە زۆر جیاواز بوون لە کەسانی تر[٢]، بۆیە لەو ڕوانگەیەوە چەند تایبەتمەندییەکی کەسی بەهرەمەند دەستنیشان دەکەین.

---

[١] بڕوانە: توجيه الشباب المبدع وكيفية رعايتهم، د. وجدة عواد المشهداني، ص٣٠٦.

[٢] الجبوري، محمود شكر محمود، من الموهوبين ولماذا نرعاهم؟ رسالة الخليج العربي، الرياض ١٩٨٥. وجعفر، نوري، الأساليب المتبعة في رعاية الموهوبين في الغرب وبالنسبة للمشروع العراقي، ندوة رعاية الموهوبين، مطبعة وزارة التربية، بغداد، ١٩٨٤.

**تایبەتمەندییەکانی گەنجی بەهرەدار**

**یەکەم: لە پێکهاتەی گشتیی جەستەیی و مەعنەوی و هزریدا جیاوازن.**

بەهرە پێویستی بە هێزی هەمەلایەن هەیە، بەتایبەتی توانا جەستەیی و هزرییەکان، بەهرەدارەکان لەم ڕووانەوە زۆر بەهێز و بەتوانا و جیاوازن.

**دووەم: تێکەڵبوونیان لەگەڵ کۆمەڵگەدا خێرا و کارایە.**

کەسی داهێنەر و خاوەن بەهرە لەگەڵ کۆمەڵگە ئاوێتە و تێکەڵ دەبێت، خۆی دەگونجێنێت و تێکەڵبوونەکەشی بە شێوازێك دەبێت وەك کەسانی تر نییە. دەرئەنجامی توێژینەوە زانستی و مەیدانییەکانی کە ئەورووپا کردوویانە لەسەر گەنجانی بەهرەدار، دەڵێن ئەوانەی کە خاوەن بەهرەن، تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ خەڵکی زۆر جیاوازە، واتە زوو لەگەڵ خەڵکی تێکەڵ دەبن و بەئاسانی عەتف و سۆز پەیدا دەکەن. لە بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی یان ئاهەنگی ژن و ژنخوازییەك، یان لە بۆنەیەکی ئایینی، سیما و تایبەتمەندییان دەردەکەوێت. ئەو کەسانەی کە سەرکردەن، لە هەر شوێنێك ئامادە بن زۆربەی خەڵك لێیان کۆ بوونەتەوە، هێندە گەرموگوڕن دەستلەملانێیان دەکەن. حەزیان لێیە وابەستەیی و پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەری خۆیان ببەستن. قوتابییەکی بەهرەدار تێکەڵە لەگەڵ قوتابییەکانی پۆلەکەی خۆی و جاری وا هەیە بۆ پۆلەکانی تر دەپەڕێتەوە، یان لە دراوسێیەتیدا دەبینیت بەسروشت لەگەڵ کۆڵان و دەوروبەری خۆی تێکەڵ بووە، بەم تێکەڵی و هەنگاوانە هەست بە ئارامی دەکات، هەست بە بەختەوەری دەکات، بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە کە گۆشەگیر و دابڕاون و نایانەوێت تێکەڵ بن. گەنجی خاوەن داهێنان بەسروشت دڵخۆشە و بەختەوەرە بەوەی کە لەگەڵ هاوپۆلەکانی، یان هاوپیشەکانی، یان هاوڕێکانیدا تێکەڵ دەبێت.

**سێیەم: پەیوەندی دروستکردن**

خاڵێکی تر لەو خاڵانە، بەئاسانی پەیوەندی دروست دەکات و توانای دروستکردنی پەیوەندیی زۆر بەهێزە، لە عەقڵی خۆیدا هۆکار دروست دەکات و دەیبینێتەوە بۆ پەیوەندی دروستکردن. کەسی داهێنەر و بەهرەدار لەگەڵ دەوروبەری هەڵسوکەوت دەکات، پەیوەندییان هەیە، هەروەها هاوسۆزییەکی زۆریشی هەیە، ئەگەر کێشەیەکیان هەبێت بۆیان چارەسەر دەکات. ئەوانە گەنجی بەهرەدارن، چونکە داهێنانیان هەیە و بەهرەیان بەهێزە، بۆیە جاری وا هەیە لە کاتی بوونی گرفتەکاندا دەگەڕێنەوە لای ئەو. لە پێکهاتەی سروشتی کۆمەڵایەتیی ئەو کەسە وایە یەکڕاست پێی دەڵێن ئەوە فلان کەس بووەتە براگەورەمان، فلان کەس بووەتە هاوڕێی گەورەمان، لەبەر ئەوەی ئەو بەردەوام کێشەیان بۆ چارەسەر دەکات و بەردەوام ئاڕاستەیان دەکات و بەردەوام پەیوەندییان لەگەڵدا دەبەستێت.

**چوارەم: عەقڵیان بەهێزە**

خاڵێکی تر لەو تایبەتمەندییانە تایبەتمەندیی عەقڵین، واتە بە سروشت ئەوانەی کە داهێنانیان هەیە و بەهرەمەندن، لایەنی عەقڵییان زۆر بەهێزە.

## گەنج چۆن خۆی بدۆزێتەوە؟

دێینە سەر ئەوەی بڵێین ئەی گەنج، خۆت بدۆزەوە، تۆ داهێنەریت لە جیهانی جیهانگیری و جێپەنجەی خۆت دیاری بکە. لەبیرتان نەچێت، ئێمە تایبەتمەندی و ناوازەییەکانی ئێوە باس دەکەین، یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئێوە وەکوو گوتمان تایبەتمەندیی عەقڵە، واتە ئەو کەسانەی بەهرەمەندن عەقڵیان زۆر جیاوازە، عەقڵیان بە پێنج ساڵ لەپێش تەمەنیانەوەیە، بۆ نموونە تەمەنی پازدە ساڵە، بەڵام عەقڵی کەسێکی بیست ساڵی هەیە، تەمەنی بیست ساڵ بێت، عەقڵی کەسێکی

بیست و پێنج ساڵ و تا بیست و هەشت ساڵی هەیە، واتە چەند ساڵێك عەقڵی ئەو کەسانەی کە بەهرەمەندن؛ لەپێش تەمەنەکەیانەوەیە.

### پێنجەم: توانای گوتار و قسەکردن

بەهرەدار سوود لە هەموو ئەزموونێك وەردەگریت، زمانی شیرینە و دەربڕینی زۆر خۆشە، قسەکردنی زۆر لەسەرخۆیە و زوو دێتە گۆ، هەم چەمکەکان جوان دەردەبڕێت و هەم زووتریش تێدەگات.

بۆ نموونە: لە کۆلێژ مامۆستا داوای قوتابییەك دەکات بۆ ئەوەی بێتە سەر ستەیج تا گوتاری هەبێت، یان پەیامێکی هەبێت، هەر قوتابییەک خۆی دەشارێتەوە تا مامۆستاکەی نەیبینێت، بەڵام گەنجی بەهرەمەند پەلە دەکات، گوتار و پەیامی ئامادەیە و پەرۆشی قسەکردنە.

### شەشەم: ورد و بەدیقەتە

گەنجی بەهرەدار تێڕامانی بۆ بابەت و شتەکان بە لێکۆڵینەوە و پەندلێوەرگرتنە، هەنگاوێکی هەڵە بنێیت ئاگادارت دەکاتەوە. سەرنج لەسەر قسەی بەرانبەر دادەنێت، چونکە عەقڵی زۆر تیژە، لە تیژییەکەیدا ئەم کەموکورتییانە دەبینێتەوە.

### حەوتەم: دۆستی کتێب و خوێندنەوەیە

تایبەتمەندیی ژیر و بەهرەدار ئەوەیە لەگەڵ کتێب زۆر دۆستە، بە جۆرێك هۆگری بووە ناتوانێت لە ماڵ، لەناو پاس، لەناو میترۆ، لە ترامواى، لەناو قوتابخانەکەی خۆی، لەناو زانکۆ، لەناو پارکێك، لەناو کافتریایەك دەستبەرداری بێت، بەردەوام لەگەڵ کتێب دۆستە. ئەمانە ئاماژەن بە بەهرەداریی گەنج، چونکە

دەروازەی هەموو زانست و پێشکەوتنێك کتێب و خوێندنەوەیە، بەهرەداریش هۆگری کتێب و خوێندنەوەیە. هەروەها توانای خوێندنەوە و تێگەیشتنی زۆر بەهێزە، بەئاسانی یەك دێڕی بۆ دەخوێنێتەوە، دەستبەجێ لێی تێدەگات.

**هەشتەم: ئومێد و تموحاتی هەمەلایەنە**

یەکێکی تر لە خەسڵەتەکانی عەقڵی گەنجی بەهرەدار ئەوەیە دەیان تموحی هەیە. لە زانکۆیە، دەیەوێت لە یەك کاتدا چەند تموحێك، چەند هەنگاوێك بنێت. گەنجی وامان هەیە لەسەر کۆمپیوتەر دانیشتووە، دە ساڵە دوو و سێ بەرنامە فێر بووە و ناچێتە پێشەوە، هیچ تموحی نییە، بەڵام گەنجی بەهرەمەند دەبینیت دەیان بەرنامەی تر فێر بووە، هیچ پەیوەندیی بە کار و توانای ئەوەوە نییە، بەڵام دەیەوێت زیادی بکات، چونکە بەردەوام تموحی هەیە، بەردەوام دەیەوێت هەوڵ بدات، هەمیشە دەیەوێت بچێتە پێشەوە. ئەمانە هەمووی تایبەتمەندیی عەقڵیی کەسی بەهرەمەند و بەهرەدارن[1].

**چاودێریکردن و ڕەخساندنی دەرفەت بۆ گەنجی بەهرەدار**

لە باسی بەهرەداریی گەنج پێویستمان بە بابەتێکی گرنك هەیە، چۆن گەنجی بەهرەدار پێبگەیەنین و سوودیان لێ ببینین؟

بەداخەوە لە وڵاتی ئێمە و زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەم دەرفەتە بۆ گەنجی بەهرەدار فەراهەم نەکراوە، لە وڵاتانی ئەورووپی ژینگە و سیستمێکی جوان بۆ گەنجانی بەهرەدار فەراهەم کراوە، گەنجان توانیویانە لەوێ خاوەنی

---

[1] بڕوانە: حسین، محي الدين أحمد، القيم الخاصة لدى المبدعين، دار المعارف، مصر ١٩٨١. والعامري، عدي، الندا، عاصم الموهوب تشخيصه، ندوة رعاية الموهوبين، مطبعة وزارة التربية بغداد، ١٩٨٤.

زۆرترین داهێنان بن. بۆ نموونە: لە ژاپۆن کە وڵاتێکی ئاسیایی پێشکەوتووە، هەر لە پۆلی یەکی سەرەتاییەوە ئەو کەسانەی بەهرەدارن بە چەند ڕێگا و لێکۆڵینەوەیەک دەیاندۆزنەوە، لەوانە:

**یەکەم: تاقیکردنەوە و ڕاوەرگرتن**

ڕۆژانە کۆمەڵێك تاقیکردنەوەیان پێ دەکەن، کام لەم تاقیکردنەوانە لە هەمووان زیاتر دڵیان پێی خۆشە، کاغەزێك دەخەنە بەر دەستیان تا خولیا و ئاواتەکانی خۆیانی تێدا بنووسن، ئەم کەسە دەیەوێت ببێتە چی؟ هونەرمەند، ژمێریار، ئەندازیار و پسپۆڕیی تری جیاواز، لە کام لەم بابەتانە زیرەکە و خولیای هەیە، یان کەسێکە لە ڕووی فێرکردن و بواری پەروەردەوە زیرەکە، یان لە بواری مامۆستا و پێگەیاندنەوە زیرەکە، ئەمانە هەمووی دەرفەتن و لە پێشیدا دادەنرێن.

**دووەم: وەرگرتنی پرسوڕای دایك و باوك**

لە ڕێگەی قوتابخانەوە نووسراوێك ئاڕاستەی ماڵەوەیان دەکرێت، ئایا منداڵەکەیان خولیای چییە و چ ئاواتێکی هەیە، هەروەها لە ماڵەوە زیاتر حەزی لە چ بوارێك بووە، بە پێی لێکۆڵینەوەی ئێوە ڕۆژانە بە چییەوە خەریکە، تا بەهرەداریی ئەم قوتابییە بدۆزینەوە. پرسوڕا لە نێوانیاندا دەکرێت، بۆ ئەوەی بە هەردوو لا بەهرەداریی قوتابییەکە بدۆزنەوە، هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە بەرەو ئاڕاستەی پسپۆڕی و خولیای تایبەتیی ببەن.

**سێیەم: بەرەو قۆناغی خولیا و ئامانج و پسپۆڕی**

جیهان بەرەو ئاڕاستەی پسپۆڕیی ورد دەڕوات، واتە پسپۆڕییە گشتییەکان وردەوردە بەرەو پسپۆڕیی تایبەت دەچن، بۆیە پیویستە هەر لە سەرەتاوە ئەوانەی بەهرەدارن بەرەو ئاڕاستەی پسپۆڕی بڕۆن، بۆیە لە زۆربەی وڵاتان لەدوای قۆناغی سەرەتاییەوە ئەو بوارەی حەزی لێیەتی دیاریی دەکەن، ئەمە دنیای جیهانگیریی زۆر پێش خستووە، بۆیە گەنج لەم سەردەمەدا لە ئەورووپا و وڵاتانی دیکەی

پێشکەوتوو، بەتایبەتی ولاتانێکی وەکوو ژاپۆن، ئەڵمانیا، چین، وایان کردووە گەنج زۆرترین ڕۆڵی هەبێت. لە هەندێک لەو ولاتانەدا دروستکردنی کاتژمێری دەستی کە کارێکی زۆر ئاڵۆزە، بووە بە کاری ئەوانەی کە لە پۆلی شەش یان نۆ دەخوێنن، سەرنج بدە و ڕابمێنە، ئەمە لە ئایندەدا چ داهێنانێك بۆ ئەو ولاتە دەهێنێتە بەردەست!

لە ولاتی ئێمە و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بێگومان ئەو داهێنانە نییە، چونکە ئەوان دەرفەت دەڕەخسێنن، بۆ ئەوەی گەنج بتوانێت داهێنانی خۆی بکات. گەنجی ئێمە لەباتیی ئەوەی داهێنان بکات، دەگەڕێت سەردانی چەند پزیشکی دەروونی دەکات، چونکە لە ڕووی دەروونییەوە نەخۆشە، کەچی یەکێك لەم بەشانەی تەواو کردووە: پزیشکی، یان ئەندازیاری، یان بواری کۆمەلایەتی، یان تویژەری کۆمەلایەتییە.

ئەم جیاوازییە گەورەیە لەنێوان ئێمە و ئەوروپادا، لەنێوان ئێمە و لەنێوان چین، لەنێوان ئێمە و لەنێوان ئەمەریکا، لەنێوان ئێمە و ولاتێکی وەکوو ژاپۆن و وەکوو ئەڵمانیادا... گەنجەکەی ئێمە گیرۆدەیە بەدەست نەخۆشییەوە، بەدەست تواناکەیەوە، بەدەست حاڵەتە سایکۆلۆژییەکەیەوە، بەلام گەنجەکەی ئەوێ داهێنان دەکات. بۆیە دەبێت بەڕاستی پێداچوونەوەیەکی ورد بکەین لەسەر ئەوەی ئێمە چۆن بتواین ئەم جیهانگیرییە بکەینە دەرگایەکی گەورە، بۆ ئەوەی گەنجەکانمان لەو دەرگایەوە بچنە ژوورەوە و داهێنان بکەن. دەزانم وەلامی گەنج ئەوەیە دەڵێن ئێمە لە هەرێمی کوردستان بەدەست گەندەڵی و نادادییەوە دەناڵێنین، دەرفەتمان نییە، جیاوازی لەنێوان کوڕەبەرپرس و کوڕەهەژاردا زۆرە، ئەمانە هەموویان ڕاستن، بەلام ئێمە نابێت کۆڵ بدەین، یەکێك لە کارەکانمان گۆڕینی ئەم سیستمەیە، هەروەها بێئومێدنەبوونە، هەروەها ڕەخساندنی دەرفەتە لە هەر کات و شوێنێکدا بێت.

ئەمەی کە باسمان کرد، جیاوازییەکی بچووك بوو، لەوانەیە دەرفەت نەمێنێت کە بێینە سەر بابەتەکان بەدرێژی، بەکورتی: چۆن ئێمە دەرفەت برەخسێنین بۆ ئەوەی گەنجەکانمان ململانێی داهێنان بکەن، نەك شەڕیان لەگەڵ حاڵەتی دەروونی و کەسایەتیی خۆیاندا هەبێت، بۆ ئەوەی گەنجەکانی ئێمەش لە دنیای جیهانگیری

و بەرهەمەکانی جێپەنجەیان دیار بێت، نەك لە بێکاری و لە بندیوارەکاندا بن.

بەشێکی زۆری گەنجانی وڵاتی ئێمە خوێندنی تەواو کردووە، بەڵام گیرۆدەیە بەدەست بێکارییەوە، لە کاتێکدا لەوانەیە توانای داهێنانی هەبێت، بەڵام زۆر بەسروشتی ئەو گەنجە لە ئەورووپا هەلی کاری بۆ ڕەخساوە و توانای ئەوەی هەبووە زۆر داهێنان بکات و بەباشی بچێتە پێشێ و کاری ناوازە بکات. لە بەشەکانی دیکەدا قسە لەسەر ئەوە دەکەین چۆن ئێمە بتوانین دەرفەت بۆ گەنجان بڕەخسێنین و لە دنیای جیهانگیری جێپەنجەی خۆیان دیاری بکەن.

### گرفت و کۆسپی بەردەم گەنجی بەهرەدار

ژیان پڕە لە گرفت و کۆسپ و لەمپەر، گەنجی بەهرەدار لە ڕەوڕەوەی ژیانیدا کۆمەڵێك گرفتی دێتە پێش، دەبنە هۆکاری نەگەیشتن بە ئامانجەکانیان، بەم هۆکارە ناتوانن بەهرەکەی خۆیان دەربخەن و سوود و بەرهەمیان بۆ کۆمەڵگا هەبێت. گرفتەکان ئەمانەن:

١. بێباکی و نابەرپرسیارێتیی دایك و باوك: ترسناکترین گرفتی بەردەم گەنجی بەهرەدار ئەم خاڵەیە، زۆر جار دایك و باوك نازانن گەنجەکەیان خاوەنی ئەم هێزە زۆرەیە، پشتگوێی دەخەن و گوێی پێ نادەن، یان دەرفەتی پێ نادەن، یان لەو بوارەی بەهرەی هەیە؛ ڕێی لێ دەگرن و ڕێی پێ نادەن و بە ئاقارێکی تریدا دەبەن. یان پێیان وایە ئەگەر دەرفەتی بۆ بڕەخسێنن، لەدەستیان دەردەچێت و کۆنترۆڵیان بەسەریدا نامێنێت.

٢. گاڵتەکردن بە توانای گەنجی بەهرەدار: هەموو کەسێک ناتوانێت گەنجی بەهرەدار دیاری بکات و بیدۆزێتەوە، بۆیە گاڵتەکردن و بە سووك سەیرکردنی توانای گەنج دەبێتە گرفتێکی گەورە. پێی وا بێت گەنجەکەی ئەوان لەم ئاستەدا نییە، ئەوەی لە بارەی کوڕ یان کچەکەی ئەوانەوە باسی دەکەن تەنها خەیاڵە و نابێت ئەوەندە گرنگیی پێ بدرێت.

٣. ئیستغلالکردنی بەهرەی منداڵ لەلایەن دایك و باوکیەوە: دایك و باوك لە

تەمەنی خۆیاندا خولیای بڕوانامە و بوون بە پلەی یەکەم بوون، بە نموونە حەزیان لە پزیشکی بووە، نەیانتوانیوە بەدەستی بهێنن، ئێستا گەنجە بەهرەدارەکەیان لە بوارێکی تر بەهرەدارە، ئەوان ڕێگەی پێ نادەن لە بواری خۆی بخوێنێت، یان پیشەی بواری خۆی مومارەسە بکات، دەیانەوێت خولیاکەی ئەوان پڕ بکاتەوە و زۆری لێ دەکەن، لە ئەنجامدا شکست دەهێنێت.

٤. دیاریکردنی برادەر و دۆست و هاوڕێ: یەکێ لە گرفتەکانی گەنجی بەهرەدار ئەوەیە کە ناتوانێت بەئاسانی برادەر و دۆست بگرێت، بە هۆی بەهرەی عەقڵ و بیرکردنەوەیەوە بە کەس ڕازی نییە، ئەمەش لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە گرفتێکی گەورەیە.

٥. پەڕینەوەی ساڵەکانی خوێندن: زیرەکیی گەنجی بەهرەدار زۆر زۆرە، دەتوانێت ساڵانە زیاتر لە پۆلێك ببڕێت، یان زیاتر لە ئاستی خۆی بچێتە پیش، بەڵام زەمەن و سیستمی خوێندن یان پیشەوەری ڕێگەی پێ نادات، ئەمە دەبێتە ئاستەنگ و خۆی لەو ئاستەدا نابینێتەوە کە لەگەڵیاندا دانیشتووە و بە ستەمی دەزانێت و بەردەوام لە مێشکیدا دەخولێتەوە.

٦. هەستکردن بە کەموکوڕی: بەهرەدار لە ڕووی زیرەکی و توانای عەقڵییەوە زۆر بەتوانایە، بەڵام بەشێکیان لە ڕووی تێکەڵبوون و هەڵسوکەوتی برادەرانە و هاوڕێگرتنەوە کەمێك لاوازن، ئەمە دەبێتە گرفتێکی گەورە، هەست بە کەموکوڕی دەکات و جۆرێك لە نەخۆشیی دەروونیی تووش دەبێت.

٧. قوتابخانە: بەداخەوە، چونکە سیستم و مەنزومەی جیهانی ئیسلامی فەوزایە و بەردەوام لە قووڵایی کێشە و گرفتی ئابووری و ئەمنی و سەربازی دەخولێتەوە، بەتەواوی خولیای گەنجی بەهرەداری بەفیڕۆ داوە و هیچ ئومێدێکی نەک بە بەهرەکەی، بەڵکوو بە ژیان نەماوە. قوتابخانەکان وەك پێویست گرنگیی پێ نادرێت، بەتایبەتی دوای پەیدابوونی قوتابخانەی تایبەت، قوتابخانە حکومییەکان پشتگوێ خراون. قوتابخانە تایبەتەکانیش لەبەر تێچووی زۆر بۆ هەژاران نییە، قوتابیی دەوڵەمەند و کوڕەبەرپرسیش لە وڵاتانی ئێمە بە پارە دەردەچێنرێن، کەواتە بەهرە و خولیا و ئامانج هەمووی خراوەتە ئاوەوە!

**٨. پرۆگرامی خوێندن:** لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا بە هۆی هەندێک کەسی نەزانەوە یان سەرسام بە فیکری عەلمانییەوە، بۆ ئەوەی بەشدار بن لە هێنانی غەزووی فیکری ئەوروپا بۆ جیهانی ئیسلامی، کۆمەڵێك پرۆگرامی سویدی و وڵاتانی ئەوروپییان هێنایە جیهانی ئیسلامی، ئەمەش پێچەوانە بوو لەگەڵ کولتوور و ئایین و ڕۆشنبیریی گەنجانی ئێمەدا، ئەمە سەری لە گەنجی بەهرەدار شێواند و نەیتوانی خولیا و بەهرەکەی خۆی بدۆزێتەوە.

**٩. مامۆستا:** له وڵاتە پێشکەوتووەکاندا مامۆستا لە ڕووی ژیان و گوزەران و ڕێزەوە گرنگیی زۆری پێ دەدرێت، چونکە سەرچاوەی زانستی و پێشکەوتنی هەموو میللەتێك مامۆستاکانن، بەڵام لە جیهانی ئیسلامی و هەرێمی کوردستاندا مامۆستا جگە لەوەی ڕێزی لێ ناگیرێت و شەقی تێ هەڵدەدرێت، بێ مووچە و بێ ژیانە، لەبریی گرنگیدان بە قوتابیی بەهرەدار، دەبێت خەمی قەرزداری و قووت و نانی ڕۆژانەی بێت، ئەمەش دەبێتە ڕێگرییەکی گەورە لەبەردەم بەهرەداران.

**١٠. ژینگە:** سروشتی مرۆڤ وایە کە کوڕی ژینگەی خۆیەتی وەك کۆمەڵناسەکان دەڵێن، کەواتە ژینگەی زانستی و داهێنان و فیکری و هۆشیاری؛ بەهرەدار تێیدا زۆر پێش دەکەوێت، ئەگەر ژینگە بۆ بەهرەداران گونجاو نەبوو یان ژینگەیەکی نازانستی بوو، بەهرەدار تووشی گرفت دەبێت و خولیاکانی دەمرێت.[١]

**١١. حکومەت و دەسەڵات:** ئەم خاڵە لە هەموو بەربەست و گرفتەکانی تر کاریگەرترە، حکومەتە ژینگەی داهێنان و شارستانیەت و پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی دروست دەکات، هەر حکومەتیشە دەبێتە هۆی دواکەوتوویی و سەرلێشێواویی گەنج و تواناکان، دەبێتە هۆی چوونەدەرەوەی گەنجانمان و خنکان و لەناوچوونیان لە دەریاکان. ئەم پێشکەوتن و داهێنانانەی لە وڵاتان کراون و گەنج ڕۆڵی تێدا هەیە، بە هۆکار و یارمەتیی حکومەت بووە کە دەرفەتی بۆ گەنجان ڕەخساندووە تا بتوانن داهێنان بکەن. حکومەت فیکر و بیرۆکەی جیهانگیری و بەرهەمەکانی بەرهەم هێناوە و گەیاندوویەتیە جیهان. بەداخەوە لە وڵاتی ئێمەدا

---

[١] بڕوانە: توجيه الشباب المبدع وكيفية رعايتهم، د. وجدة عواد المشهداني، ص٣١٥.

حکومەت ڕێگرێکی زۆر گەورەیە لەبەردەم تواناکانی گەنجاندا، هیچ دەرفەتێك بۆ گەنج نەڕەخساوە تا داهێنان بکات. لە بارەی بەرهەمەکانی جیهانگیرییشەوە، هەر حکومەت بێباکە و هیچ فلتەرێکی دانەناوە و ڕۆشنبیریی لەسەر بەکارهێنانی بڵاو نەکردووەتەوە تا ئەم بەرهەمانە ببنە بنەمایەك بۆ گەنج کە خزمەتی خۆی و کۆمەڵگەی پێ بکات.

## تەوەری سێیەم:

## جیهانگیری خاڵە ئەرێنی و نەرێنییەکانی جیهانگیری

گوتمان پانتایی جیهانگیری پانتاییەکی زۆر بەرفراوان و گشتگیرە، ڕەهەندی زۆرە و ڕەهەنـدەکان هـەموو بەشـێکی ژیـانی مرۆڤـی گرتووەتـەوە. لـەناو ئـەو مرۆڤانەدا، بێگومان گەنج یەکێکە لە کارەکتەرە هەرە گرنگەکانی ناو ئەم شەپۆلە. یەکێکە لەوانەی کە ڕۆژانە گەمە لەگەڵ ئەو شەپۆلەدا دەکات و هەنگاوی لەگەڵدا دەنێت، چۆن بتوانێت لە هەنگاوە ئەرێنییەکان سوودمەند بێت و لە هەنگاوە نەرێنییەکان خۆی بپارێزێت. بۆیە ئەم بەشە، وەك لە ناونیشانەکەیەوە هاتووە، تایبەتە بە باسی خاڵە نەرێنی و ئەرێنییەکانی جیهانگیری و بەرهەمەکانی بەتایبەتی بۆ گەنج.

گومانی تێدا نییە هەر شتێك کە لە دنیادا ڕوو دەدات بەشێکی ئەرێنییە و بەشێکی نەرێنییە، جاری وایە باش و ئەرێنییەکەی لە نەرێنییەکەی زۆرترە، جاری واش هەیە بەپێچەوانەوە نەرێنییەکەی لە ئەرێنییەکەی زۆرترە، جاری واش هەیە کەسەکان دەتوانن سوودمەند بن بەتەواوی لە ئەرێنییەکانی و خۆیان لە نەرێنییەکانی بپارێزن.

بابەتی ئێمە ئاڕاستەکردنی گەنج و هەرزەکارە، ئەوەی کە چۆن بتوانێت هەموو ئەو ئەرێنییانەی کە لە جیهانگیریدایە؛ دەستی بکەوێت و خۆی پێ بەهرەمەند بکات و ئاڕاستەی ژیانی خۆی پێ بگۆڕێت، ئاڕاستەی ڕۆشنبیری و فیکری و کولتووری و بابەتەکانی تری خۆی پێ بگۆڕێت.

## گەنج چۆن دەتوانێت دەرفەت لەو خاڵە ئەرێنییانە وەربگرێت؟

بەکارهێنان و هەنگاونان لەگەڵ جیهانی جیهانگیری لەنێوان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامیدا زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەورووپا و ئەمەریکا. جیهانگیری بەرهەمی ئەورووپا و ئەمەریکایە، هەر لە سەرەتاوە بە پلەبەندی و قۆناغ سەری هەڵداوە، بۆ هەر قۆناغێك زانیاری و هۆشیاری و چارەسەر بۆ گرفتەکانی دۆزراوەتەوە، لە هەموو کەناڵ و ڕاگەیاندنەکان زانیاریی ورد بۆ چۆنیەتیی هەڵسوکەوت لەگەڵ جیهانگیریدا بڵاو کراوەتەوە، هەروەها خاڵی نەرێنی و ئەرێنیی جیهانگیریی بۆ ڕوون کراوەتەوە.

ئەوانەی کە ئێستا سوود لە جیهانگیری وەردەگرن و سوودمەندن بۆ خۆیان و بۆ دەوروبەریان، لە جیهانی ئەورووپی و ئەمەریکین، لەوێ ڕێژەکی دەیان هێندە لە ئێمە زیاترە. بۆ نموونە (٨٤%)ی جیهانی ئەمەریکی و ئەورووپی سوود لە بواری تەکنەلۆژی و بواری جیهانگیری وەردەگرن، لەوێشەوە داهێنان دەکەن. (٩٠%)ی داهێنەرەکان لە داهێنانی پزیشکی و پیشەسازی و کشتوکاڵ و بابەتەکانی دیکە؛ لە ئەورووپا و ئەمەریکادان، بە هۆکاری جیهانگیری. کەواتە جیهانگیری بووەتە دەرگایەکی گەورە تاوەکوو گەنجانی ئەورووپی و ئەمەریکی و وڵاتانی ڕۆژئاوا بەگشتی داهێنان بکەن و گەشە بە تەکنەلۆژیا بدەن، گەشە بە فرۆکە بدەن، گەشە بە پەیوەندییەکان بدەن، گەشە بە ژینگە بدەن، گەشە بە تەواوی سێکتەرەکانی ژیان بدەن.

بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ورد بەرەوە، ڕێژەی (٣٠%) یان کەمتری گەنجانمان توانای داهێنانیان هەیە. بۆیە دەبینیت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەنجەکانی لە ڕۆژئاوا زۆرترن، بەڵام بێ داهێنان و بێ بەرهەمن، بێ هەنگاوی داهێنان و نوێکارین، لەبەر ئەوەی ئێمە نەمانتوانیوە وەکوو پێویست سوود لە دنیای جیهانگیری وەربگرین.

ڕۆژئاوا بەو شێوازە هەڵسوکەوت دەکات، بۆیە ئێستا ژیان و تەکنەلۆژیا و

داهێنـانی ئەورووپییـەکان، تـا دەگاتـە تەنانـەت پۆشـاك و فـڕین و بەشـەکانی تـر، هەمووی لە ئەورووپاوە گەشە دەکات، ئەویش بە هۆکاری جیهانگیری.

کارەساتەکە لێرەدا ئەوەیە لـە جیهـانی ئیسـلامی و ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا ئێمـە بووینـە میللـەتێکی بەکاربـەر، تـەنیا دەخـۆین و بـەکار دەهێنـین، داهێنانمـان نییـە، هیچـی نوێمـان نییـە. ئـەوەی بۆمـان دەرکـەوتووە ئەوەیـە گـەنجان لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستدا نەیانتوانیوە وەکوو پێویست سوود لە جیهانگیری وەربگـرن. هەڵبـەت جێـی خۆیـەتی لەسـەر ئەمـە هەڵوەسـتە بکـەین و لـە دەرفەتێکدا باسـی ئـەوە بکـەین چـۆن سوود لە جیهانگیری وەربگرین، کە بێگومـان ئـەوە لـە بابەتەکانی داهـاتوودا باسـی دەکەین.

### دەرفەتەکانی جیهانگیری بۆ گەنج بەبێ جیاوازی

جیهـانگیری توانیویـەتی ئاسـانکاریی زۆر گـەورە بکـات، تـۆی گـەنج دەتوانیـت سوودی لێ ببینیت، وەکوو ئەوەی کە ڕۆژئاوا و ئەمەریکا سوودیان لێ بینیوە.

#### یەکەم: دەرفەتی گەیاندن

هەموو هۆکار و ئامرازێکی گەیاندن و نـەقڵی بۆ فەراهەم کردوویت، بێگومـان ئەوە بەرهەمی جیهانگیرییە، بەئاسانی فڕۆکـە بـەکار دەهێنیت و بـەرەو ئـەمەریکا و چـین و ژاپـۆن و ئـەڵمانیا و پێشـکەوتووترین وڵاتـانی پزیشـکی و تەکنـەلۆژی دەڕۆیت.

گەنج دەبێت بزانێت جیهانگیری ژیانی بۆ ئـەویش فەراهـەم کـردووە وەک چـۆن ژیانی بۆ گەنجێکی ئەورووپی بەردەست و ئاسان کردووە.

**دووەم: دەرفەتی بازرگانی**

ئازادییەکی گەورەی بازرگانیی بۆ هێناویەتە بەردەست و وای بۆ ڕێك خستوویت تۆ بەئاسانی دەتوانیت بازرگانی بکەیت لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاکانی سەردەمەوە، چونکە بازرگانیکردن بەشێکی گەورەی داهێنان و پێشکەوتن و شارستانیی سەردەمە.

ئەی گەنج، ورد بەرەوە، چەندان ڕێکخراوی گەورەی بازرگانی لە جیهاندا کراونەتەوە و تۆش دەتوانیت تێیاندا بەشداری بکەیت و لەو دامەزراوە بازرگانییانەدا بازرگانی بکەیت و وەك دەبینین بازرگانی بە هۆی جیهانگیرییەوە زۆر ئاسان بووە.

**سێیەم: دەرفەتی تەکنەلۆژیا و جیهانی ئەلکترۆنی**

ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان گەورەترین دەرفەتی بۆ مرۆڤایەتی لە هەموو بوارەکاندا ڕەخساندووە، داهێنان و پێشکەوتنی بۆ گەنجان فەراهەم کردووە، زەمەنی بۆ بەرەکەتدار کردووە، تەمەنی مرۆڤی لە ڕووی بەرهەمەوە درێژ کردووە. جاران لە ڕۆژێکدا بەرهەمت چەند بووبێت، ئێستا بە هۆکاری ئامێرە ئەلکترۆنییەکان سەد هێندە بووەتەوە. پێم وایە مرۆڤ لەوەتەی هەیە، نەگەیشتووەتە ئەم ئاستە پێشکەوتن و جیهانە خێرایە. ئینتەرنێت و تەکنەلۆژیای سەردەم دەرفەتێکی گەورەی بۆ هەموو گەنجەکان ڕەخساندووە، تاکوو لە هەموو جیهاندا تۆی گەنج بتوانیت ڕۆشنبیریی وڵاتانی ئەورووپی و ئەمەریکا و ئاسیا و ئەفەریقا و کیشوەرەکانی دنیا بە چەند کلیکێك بگاتە دەستت.

کەواتە تۆی گەنج لە بازنەیەکی لۆکاڵی هاتوویتەتە دەرەوە و چوویتەتە بازنەیەکی گەورەی جیهانییەوە، ئێستا ڕۆشنبیرییەکەت و بیرکردنەوەکەت و لێزانییەکانت و هەنگاوەکانت و زانستەکەت هەمووی بووەتە زانستێکی جیهانی، ڕۆشنبیرییەکی جیهانی و کەسێکی جیهانی.

بێگومان جیهانگیری وای کردووە تۆ ببیتە کەسێکی جیهانی و جیهانییانە بیر بکەیتەوە و لە دنیا بڕوانیت و سوود وەربگریت و بەشداری لە داهێنان و ئاوەدانکردنەوەی جیهان بکەیت. جیهانگیری ئەو دەرفەتەی بۆ تۆ ڕەخساندووە تاوەکوو تۆ بتوانیت کەسێکی جیهانگیر بیت لە عەقڵ و حیکمەت و دانایی و زانست و فیکر و ڕۆشنبیری و تا دەگاتە ژیار.

### چوارەم: ڕاگەیاندن

هەموو تاکێك بە واستەی جیهانگیری بووەتە خاوەنی کەناڵێکی سەربەخۆ، گوزارشت لە بۆچوون و خولیای خۆی بکات و خۆی بە جیهان بناسێنێت و سوود لە جیهان وەربگرێت، هەروەك سوود بە هەموو جیهانیش بگەیەنێت. بوارێکی زۆر گەورەی بۆ تۆ ڕەخساندووە، ئاسانکاریی کردووە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی خستووەتە بەردەستت. تۆ لێرەوە دەتوانیت بە هۆکارەکانی پەیوەندیی جۆراوجۆری وەك وەتسئەپ و تێلیگرام و سکایپ... هتد، لەگەڵ دەرەوەدا، لەگەڵ کەناڵە جیهانییەکاندا، کەسایەتی و داهێنان و توانای خۆت بە جیهان بگەیەنیت. جاران هەر چەندە بەتوانا بوویتایە، چونکە جیهانگیری نەبوو، بەرهەمەکەت بۆ وڵاتەکەی خۆت یان شارێکی بچووك بوو، ئێستا بە هۆکاری جیهانگیری دەتوانیت ئەم داهێنانەی کە کردووتە، بۆ نموونە داهێنانێکت لە بواری ماتماتیك یان کیمیا یان فیزیا، یان لە بواری پزیشکی، یان لە بواری ئایینی یان لە بوارەکانی تردا کردووە؛ بە جیهانی بگەیەنیت.

بڕوانە، دەبینیت لە گوندێك کەسێك پەیدا بووە فڕۆکەیەك دروست دەکات، دەستبەجێ بەئاسانی بەجیهانیی دەکات و هەموو جیهان دەزانێت ئەو کەسە خاوەنی فڕۆکەیەکە و بۆخۆی داهێنانی تێدا کردووە.

### پێنجەم: نووسین و ڕۆژنامەوانی

ئەمڕۆ نووسین و کاری ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن بووەتە یەکێك لە بوارە هەرە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤ، زۆرترین کەس توانای خۆی لێرەوە پیشکەش بە جیهان دەکات. ئەی گەنج، کاتێك باسی پەیجەکەی خۆت دەکەیت، ئەکاونتەکەی خۆت

دەبینیت، ئەم پەیج و ئەکاونتە بە هۆکاری جیهانگیری تۆی کردووەتە خاوەنی ڕاگەیاندنێکی سەربەخۆ و فەزایەکی گەورە، واتە هەموو تاکێك ڕاگەیاندنێکی جیهانیی هەیە نەك لۆکاڵی. جاران دەوڵەتێك ئەگەر کەناڵێکی لۆکاڵیی هەبووبێت، بەڵام ئێستا هەموو تاکێك کەناڵێکی ئاسمانیی لە ماڵەکەی خۆیدا هەیە و پەنجەی پێدا دەنێت و عەقڵ و ژیریی خۆی و توانای خۆی و نووسینی خۆی بە جیهاندا بڵاو دەکاتەوە. جیهانگیری ئەو دەرفەتەی بۆ تۆ بەردەست کردووە و فەراهەمی کردووە، بۆیە هەردەم بەنەرێنی سەیر مەکە، ئەمانەی کە دەیبینیت هەمووی ئەرێنی و قازانج و کەڵکەکانی جیهانگیرییە بۆ تۆ، بەڵام بە مەرجێک تۆ هەبیت و بتوانیت بیسەلمێنیت.

### شەشەم: گەشەی بواری هونەری

بابەتی هونەر لەو بابەتە سایکۆلۆژییە جوان و دەروونناسانەی مرۆڤە کە بە هۆیەوە چێژ دەبینێت و ئارامە. گۆرانی و مۆسیقا و وێنەکێشان و سینەما و بواری دیکە، گەنج دەتوانێت لەم بوارانەدا داهێنانی گەورە بکات بۆ ئایین و نیشتمان و گەل و مرۆڤایەتی، ئامراز و تەکنەلۆژیا و ئامێری سەردەمی بە هۆکاری جیهانگیری بۆ فەراهەم کراوە و تێیدا بەهرەمەند و سوودمەند دەبێت، بە هەمان شێوە سوود بە جیهانیش دەگەیەنێت.

### حەوتەم: فەراهەمکردنی فێربوونی زمان

زمان هۆکاری تێگەیشتن و بەیەکگەیشتنی گەلانە، هۆکاری گۆڕینەوەی ڕۆشنبیری و فیکر و فەلسەفە و زانستی نێوان مرۆڤەکانە. کەناڵە جیاوازەکانی سۆشیالمیدیا و تەکنەلۆژیای سەردەم کە بەرهەمی جیهانگیرییە، هەموو ماڵێکی کردووەتە قوتابخانە و زانکۆ، تا بەئاسانی ئەوەی بتەوێت بە تێچوویەکی زۆر کەم و بە کاتێکی دیاریکراو فێری ببیت. جاران فێربوونی زمان ئاستەنگی زۆری لەپێش بوو، ئێستا جیهانگیری ئاستەنگەکانی لا داوە و هەموو ماڵێکی کردووەتە قوتابخانەی فێربوونی زمان. ئەی گەنج، ئەمە بەرهەمی جیهانگیرییە، بۆ تۆی ڕەخساندووە تا لە ماڵەکەی خۆتدا فێری زمان ببیت و پەیامەکانی خۆت بە زمانی جیاواز بە جیهان بگەیەنیت بە کەمترین کات و تێچوو.

بە هۆی فێربوونی زمانەوە، هەر جۆرە پەیامێکی ئایینی و ئەخلاقی و پەروەردەیی و پەیامی فێرکردن و پەیامی هزر و کولتوور، هەتا دەگاتە ئەوەی دەتوانیت دیدار و گفتوگۆ لەگەڵ دنیادا بکەیت.

### هەشتەم: خاوەنی کۆمپانیا

کاتێك ناوی کۆمپانیا دەهێنین، پانتاییەکی جوگرافی و دارایی و بازرگانییەکی گەورەمان دێتە پێش چاو، بەڵام ئێستا بە هۆکاری جیهانگیری و تەکنەلۆژیای سەردەم، گەنجان دەتوان ببن بە خاوەنی کۆمپانیا. کارخانەگەلێکی ئاسیایی چوونەتە ئەمەریکا و کۆمپانیای ئەمەریکی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کارخانە و دامەزراوەگەلێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش لە ئەورووپادا کار دەکەن.

ئەم ئاڵوگۆڕانە لە وڵاتێکی گەشەسەندوو بۆ وڵاتێکی دواکەوتوو زۆر زۆر گرنگیی پێ دراوە، بۆیە دەبینین لە وڵاتی ئێمە و بەشێك لە وڵاتەکان تەکنەلۆژیای بەهێز و ئەندازەیی و بواری فیکریی بەهێز فەراهەم هاتوون، لەبەر ئەوەیە جیهانگیری دەرگایەکی فراوانی بۆ تۆ کردووەتەوە ئەی گەنج، تا لە ڕێگەی کۆمپانیاکانەوە بتوانیت داهێنانی بکەیت، یان لەگەڵ ئەواندا فێری داهێنان ببیت.

### نۆیەم: دەرگای زانکۆکانی جیهان بۆ گەنج کراونەتەوە

یەکێك لە خاڵەکانی تر کە جیهانگیری بۆ تۆی فەراهەم کردووە، کردنەوەی هەزاران زانکۆ و کۆلێژی بیانییە لە جیهانی ئیسلامیدا، هەموو وڵاتان زانکۆی ئەمەریکی و فەرەنسی و وڵاتەکانی تری تێدایە. دەچیتە ناو زانکۆیەکی تری جگە لە جیهانی خۆت، ڕۆشنبیری و فیکر و کولتوور و بیرکردنەوە و تەکنەلۆژیا و شوناس و ژینگەی ئەو وڵاتەت لەوێ بۆ دەردەکەوێت.

لێرەدا کورتی دەکەمەوە کە ئایا خراپی و ئەرێنییەکانی جیهانگیری چین و کامانەن، ئەویش لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا و پاشانیش دێمە سەر باسی نەرێنی و ناپەسەندییەکانی جیهانگیری.

## بەکورتی: لایەنە ئەرێنی و چاکەکانی جیهانگیری

### یەکەم: کردنەوەی دەرگای زانیاری بە ڕووی جیهان

جیهانگیری دەرگای شۆڕشی زانیاریی لەبەردەم مرۆڤەکاندا کردووەتەوە و بە هۆیەوە توانیویەتی بەشدار بێت لە پێشخستن و گەشەسەندنیدا، هەموو تاکێك بواری بۆ ڕەخساوە تا لەم ڕەوڕەوەی تەکنەلۆژیایە بەشدار بێت و لە هەمان کاتدا خۆی تێدا بەهرەمەند بکات.

### دووەم: فەراهەمکردنی ژیانی ئیسراحەت

تەکنەلۆژیا ئامێر و پێداویستییەکانی ژیان و هۆکارەکانی گەیاندنی بۆ مرۆڤەکان فەراهەم کردووە لە هەموو بەشەکانی ژیان بە بیستراو و بینراوەوە، تا وای لێ هاتووە هەمووی بە کلیك و کۆنترۆڵ و دەستلێدانێکی ئۆتۆماتیکی تەواوی کارەکان بەڕێوە ببات. لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتووە لەگەڵ جیهان دەدوێت. ئەمانە ژیانی ڕەفاهیەت و خۆشگوزەرانین کە فەراهەم کراون، خزمەتن بۆ گەنج و تەواوی توێژەکانی تر کە هەمووی بەرهەمی جیهانگیرییە.

### سێیەم: زیادبوونی پانتایی ڕۆشنبیری

کەسی ڕۆشنبیر چەندە بزانێت و زانیاریی فراوان و گشتگیر بێت، ئەوەندە سوودبەخشترە بۆ کۆمەڵگا. جاران بە هۆی نەبوونی جیهانگیری و بوونی دنیای لۆکاڵی زانیارییەکان کرچوکاڵ و لۆکاڵی بوون، لە بوارێك لە بوارەکاندا بوون، ئێستا گەنج لە ڕێی جیهانگیرییەوە دەتوانێت ڕۆشنبیری لە زۆربەی زانستەکانی ژیان وەك ژینگە و پزیشکی و کولتووری و... هتد؛ فێر ببێت و دەستی بکەوێت، ئەمەش دووبارە خاڵە ئەرێنییەکانی جیهانگیرییە.

### چوارەم: فەراهەمکردنی مافی مرۆڤ و ئازادیی تاك

ماف بەردەوام داوا دەکرێت، نادرێت. بە درێژایی مێژوو ستەمکارەکان ویستوویانە ستەم لە خەڵك بکەن و ماف و ئازادییەکان بەرتەسك بکەنەوە و زەوتیان بکەن، ئینجا بیشارنەوە و نەهێڵن کەس ئاگاداری ئەم ستەم و قۆرخکارییە بێت. تاکێکی بێدەرامەت و بێکەس جاران نەیدەتوانی دەنگی هەڵبڕێت و ستەمەکەی خۆی بە جیهان بگەیەنێت، ئێستا بە هۆی کرانەوەی دنیا و سۆشیالمیدیا و تەکنەلۆژیای سەردەمەوە هەموو تاکێك هاواری دەگەیەنێتە جیهان، بۆیە ئێستا ئەگەر گەنج بتوانێت داوای ماف و ئازادییەکان بکات، ئاسانتر وەردەگیرێن بە ڕێگەی جیهانگیری.

دەیان خاڵی تری ئەرێنی هەن کە جیهانگیری بۆ گەنجی فەراهەم کردووە، تۆش ئەی گەنج، هەوڵ بدە ئەو هەموو خاڵە ئەرێنییانە کۆ بکەیتەوە و کەڵکیان لێ ببینیت و لەگەڵیاندا هەڵبکەیت.

لە سەرەتای ئەم تەوەرەماندا باسی لایەنی کەڵك و ئەرێنی و جوانییەکانی جیهانگیریمان کرد، بێگومان خۆ هەر باسکردنەکەی ئێمە بابەتەکە نابڕێنێتەوە، بەڵکوو لایەنی گرنگتر ئەوەیە پێویستە تۆی گەنج دەرفەت بڕەخسێنیت هەموو ئەو ئەرێنی و چاکییانە بۆ خۆت بقۆزیتەوە و لە ژیانی خۆتدا گەشەی پێ بدەیت، بۆ ئەوەی جێپەنجەت لە ژیاندا دیار بێت.

ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەرفەتێکی زێڕینە بۆ ئەو کەسەی بیەوێت جێدەست و پەنجەمۆری لە ژیاندا دیار بێت، تۆ ئەی گەنج ئەمڕۆ جیهانی جیهانگیری گەورەترین دەرفەتی بۆ ڕەخساندوویت تا بەئاسانی بتوانیت جێپەنجەت دیار بێت. پێش هاتنی جیهانگیری، دەیان داهێنەر هەبوون و لە ژیاندا نەیانتوانیوە وەکوو پێویست جێپەنجەی خۆیان دیاری بکەن، بۆیە تۆ دەرفەتێکی گەورە و زێڕینت لەپێشە جێپەنجەی خۆت دیاری بکەیت.

## خاڵە نەرێنی و خراپەکانی جیهانگیری

جیهـانگیری بـەم پانتـایی و فراوانـی و هەمەلایەنییـەی خـۆی بێگومـان ناتوانرێـت سـنوردار بکرێـت لـە نـەرێنی و خراپـەکانی، بـەڵام بـە پێـی توانـا بەشـێك لـەم خاڵـە پەیوەندیدارانەی کە بە گەنجەوە پەیوەستن، دەخەینە ڕوو.

هـەموو شـتێك خـاڵی ئەرێنـی و نەرێنیـی هەیـە، لـە ناویانـدا جیهـانگیری. لـە سـەرەتاوە گوتمـان جیهـانگیری لەلای هەنـدێك وا باسـی دەکـەن کـە غـەزوویـەکی ڕۆشـنبیریی ئەمـەریکییـە، واتـە ئـەمەریکا ئیـدارەی دەکات و بـەڕێوەی دەبات، بۆیـە ناویـان نـاوە "ئەمرەکـە"، چونکـە لـە ڕێـی ئـەم جیهـانگیرییەوە فیکـر و ئـابووری و کولتوور و تـا دەگاتـە بابەتـەکاتی تـری ژیـان، ئـەمەریکا ئاڕاستەی دەکات و بـەکاری دەهێنێت. لێرەدا باسی ئـەو زیـان و خراپیيانـەی جیهـانگیری دەکـەین کـە بـۆ جیهـانی ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە ناویاندا بۆ توێژی گەنج هێناویەتی.

#### یەکەم: نەبوونی هیچ پێشینە و خۆئامادەکردنێك

ئەو جیهانگیرییە لە کاتێکدا گەیشتووەتە ئێمە کە هیچ ئامادەکاریمان بۆ ئەو هاتنـە نـەکردبوو و سـاز نـەبووین و نـەمانزانیوە چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکـەین. بەبێ ڕاهێنان و خۆتەیارکردن و بەبێ زانیاریی پێشینە و بـەبێ خول و خۆسـازکردن، دەمودەست لەگـەڵ جیهانگیریـدا ئامێزمـان بـە یەکدا کردووە، بۆیـە تەماشا دەکـەین زۆر شوێنەواری نەرێنیی بەجێ هێشتووە.

#### دووەم: دروستکردنی بۆشایی و لێکترازانی خێزان

لە کۆمـەڵگە و لەناو توێژەکـانی خەڵکدا بۆشـایی زۆری دروسـت کردووە، ئێسـتا گەنج لە جیهانی تایبەتدا و لەناو دنیای جیهانگیریدا و بەتەمەنەکانیش لـە لایـەکی دیکە دەژین و لە یەك جیا بوونەتەوە. جاران تێکەڵییەك هـەبوو، هاوبەشـییەك هـەبوو، پێکەوەیی و هاوکارییەك لە نێوانیاندا هەبوو، لەنێوان گەنج و پیر و پیـاو و ئـافرەت و

هەموو پێکهاتەکاندا، بەڵام ئێستا جیهانگیری هەمووانی لە یەك ترازاندووە و لێکی دابڕیون.

بۆ نموونە لەم ڕۆژانەدا لە جێگەیەك بووم، پیاوێك و ئافرەتێك پێکەوە بوون و منداڵێکیان لەنێواندا بوو، پیاوەکە سەرقاڵی مۆبایلی خۆی بوو، ئافرەتەکەش خەریکی مۆبایلی دەستی خۆی بوو، دیار بوو منداڵەکەش هەندێك داخوازیی هەبوو، دەگریا و هاواری دەکرد، نە پیاوەکە وەڵامی دەدایەوە و نە ئافرەتەکە خەمی لێ دەخوارد. دەچووە لای پیاوەکە، بەرەو لای ئافرەتەکە پاڵی پێوە دەنا و ئافرەتەکەش بۆ لای پیاوەکە پاڵی پێوە دەنا. ئەمە واتە کارەسات، واتە جیهانگیری شیرازەی تێك داون و توێژەکان لە یەك ترازاون و لە یەکی جیا کردوونەتەوە، واتە توێژی منداڵ و توێژی دایك و توێژی باوك، ئەمە نەرێنیی دنیای جیهانگیری و ئینتەرنێت و بواری تەکنەلۆژیای سەردەمە.

### سێیەم: زیادبوونی دیاردەی چاولێکەری

خاڵێکی دیکەی نەرێنی ئەوەیە کە بەڕاستی لەلای لاوان چاولێکەری زۆر بووە، بۆ نموونە ئەگەر بەگشتی تەماشای سۆشیالمیدیا بکەین، ئەوەندەی خەڵك سەرقاڵی چاولێکەرییە، خەریکی داهێنان نییە، بە پێچەوانەی ئەورووپا و وڵاتانی پێشکەوتووەوە کە ڕۆژبەڕۆژ لە پێشبڕکێی داهێنان و نوێکاریدان. بۆ نموونە لە ژاپۆن لە بواری ئامێرەکان و مۆبایلدا داهێنانی هەیە، لەوەوە کێبڕکێ دەکات، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا بە گەورە و بچووکەوە، تەنانەت نوخبەکەش سەرقاڵ و خەریکە بە چاولێکەرییەوە.

### چوارەم: بەهای مرۆڤەکان لە مەترسیدایە

بە هۆکاری جیهانگیری، پرەنسیپ و بەهای مرۆڤایەتی لەبەردەم هەڕەشەیەکی ترسناکدایە. بە کەمترین ماوە زۆرترین بەهای خەڵك لەدەست دەدەین، یان درۆ و بێبەڵێنی، هەموو جۆرەکانی تری شکستی بەها، یان شکستی پرەنسیپ. لێدان لە سومعەی تاکەکان بە هۆکاری دروستکردنی سیناریۆ لە ڕێگەی سۆشیالمیدیا، بە ڕێگەی بڵاوکردنەوە و دروستکردنی وێنەیەك بێت، یان هەڵەیەکی سادە کە هەموو

مرۆڤێك تووشی دەبێت، بۆیە هیچ کەسێک لە ئەماندا نییە و ئەمەش خاڵێکی زۆر ترسناکی جیهانگیرییە.

### پێنجەم: بردنی خێروبێری وڵاتان

بە هۆی جیهانگیرییەوە سامان و خێروبێری هەموو دنیا لەلایەن وڵاتانی ئەورووپی و ئەمەریکاوە ئیستیغلال کراوە. بۆ نموونە جیهانی ئیسلامی لە سەددا شەست و سێی سامانی نەوت و کانزاکان و بابەتەکانی تری ژێر زەویی دنیا پێك دەهێنێت، هەموو ئەو خێروبێرە دەوڵەتانی گەشەسەندوو و پێشکەوتوو و دەوڵەمەندانی سەردەم دەیانبات. ئەمەش خاڵێکی نەرێنیی دنیای جیهانگیرییە، چونکە ئەوان ئەزموون و خاوەندارێتیی جیهانگیری دەکەن، دەزانن چۆن ماڵ و سامان و خێری وڵاتان بۆ خۆیان کۆ بکەنەوە. کەمترین سەروەت و سامان لە وڵاتانی ئەوانە و زۆرترینیان لەلای ئێمەیە، کەچی ئەوان لە خۆشگوزەرانی و ئێمەش لە قاتوقڕی.

### شەشەم: بۆشایی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگا

جیهان بە ئەندازەی ئێستا سەرمایەدار و دەوڵەمەندی بەخۆیەوە نەبینیوە، لە ئەنجامدا چینی جیاواز و چینایەتیی دروست کردووە، بۆشاییەکی کۆمەڵایەتی و ئابووریی زۆر گەورەی لەنێوان تاکەکاندا دروست کردووە. بۆ نموونە بەشێکی سیستمی دنیای جیهانگیری وای کردووە بەشێك لە خەڵك زۆر زۆر دەوڵەمەند بوون و بەشێکی دیکەی زۆر زۆر نەدار و هەژار بن، بە ئەندازەی ئەوەی لە برساندا بمرن، وەك ئەوەی لە سۆماڵ و هەندێك وڵاتی ئەفەریقی هەیە. لێرەدا پانتاییەکی گەورە و ترازانێکی گەورەی دروست کردووە، تاوەکوو هەژار و دەوڵەمەند بەتەواوی لە یەك بترازێن، هەم لە ڕووی ئابوورییەوە و هەم لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە.

### حەوتەم: زاڵبوونی کولتووری ڕۆژئاوا بەسەر جیهانی گەنجاندا

لە سەرەتا گوتمان بەشێك لە بیرمەندان پێیان وایە جیهانگیری ئەمرەکەیە و ئەمەریکا بەڕێوەی دەبات و ئاڕاستەی دەکات، لەم ڕووەوە توانیویەتی کولتوور و

ڕۆشنبیریی ئەمەریکا و ئەورووپا لە زۆربەی جومگەکانی ژیان بەسەر کولتوور و ڕۆشنبیریی جیهانی ئیسلامیدا بە هۆکاری جیهانگیری زاڵ بکەن و بڵاوی بکەنەوە.

هەنووکە گەنجی ڕۆژهەڵات تایبەتمەندی و ناوازەییەکی خۆی نەماوە، هەر چی شك دەبات و هەیەتی چاولێکەریی ئەورووپایە، تەنانەت جلك و پۆشاکەکەشی هەروەکوو ئەورووپا لەبەر دەکات.

**هەشتەم: ململانێ و دژایەتیکردن و پێکدادانی شارستانیەتەکان**

هەردوو تیۆری هندکتۆن و فۆکۆیاما لە دنیای جیهانگیریدا لە بارەی شارستانیەتەوە ئێستا پەیڕەو دەکرێن، دەیانەوێت تیۆری "صراع الحضارات، نهایە التاریخ" لە ڕێگەی جیهانگیرییەوە بەسەر جیهاندا بسەپێنن، شارستانیەتەکان پێکدا بدەن، یان شارستانیەتی خۆیان بەسەر تەواوی شارستانیەتی دنیادا بسەپێنن و ئەوانی تر بەتەواوی بسڕنەوە. ئێمە وەك موسوڵمان بڕوامان بە ناوەندی شارستانیەت هەیە (المنتدی الحضارات)، واتە هەموو شارستانیەتەکان پێکەوە کۆ بکرێنەوە و خزمەتی مرۆڤایەتیی پێ بکرێت بەگشتی. موسوڵمانان لە سەردەمی زێڕینی خۆیاندا توانییان شارستانیەتی ئیسلامی و هیند و چین و ڕۆما و فارس پێکەوە کۆ بکەنەوە و خزمەتی جیهانی پێ بکەن، دان بە خاڵە ئەرێنییەکاندا بنێن و لە خاڵە نەرێنییەکان دوور بکەونەوە، کەچی شارستانیەتی ڕۆژئاوا داوای پێکدادان و یەکتر سڕینەوە دەکات.

پێکدادانی شارستانیەت واتە شارستانیەتەکان بەسەر یەکتریدا زاڵ ببن و لە کۆتاییدا نابێتە خزمەتکردنی مرۆڤەکان، بەپێچەوانەوە مرۆڤایەتی تووشی هەزاران قەیران و گرفت دەکات و بێگومان کردووشیەتی. هۆکاریش هەر لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوان باوەڕیان بە پێکدادانی شارستانیەتەکان هەیە و ئێمەش باوەڕمان بە پێکەوەهەڵکردن و هەماهەنگیی شارستانیەتەکان هەیە. ئێمە بڕوامان بە ناوەندێکی ڕۆشنبیری و شارستانیەت هەیە تاوەکوو خزمەتی مرۆڤ بکات، لە هەر بوارێك لە بوارەکاندا بێت کە مرۆڤ پێویستی بە خزمەت بێت، ئەم

شارستانیەتانە بێن و پێکەوە بن، بەڵام جیهانگیری وای کردووە پێکدادانی شارستانی و تێکگیرانی نێوانیان دروست ببێت.

### نۆیەم: لێکدابڕان و گۆشەگیریی تاکەکان بە هۆکاری جیهانگیری

جیهانگیری لە لایەکەوە هەموو جیهانی کردووەتە دێیەك، لە لایەکی ترەوە بە هۆی هەندێك ئامێری سۆشیالمیدیاوە تاکەکانی لێك جیا کردووەتەوە، هەر تاکێك خەریکی ژیانی تایبەتیی خۆیەتی و خەمی تاکەکانی تری نییە، تا ڕادەی نامۆیی.

دابڕان لە جیهانی کۆمەڵایەتی و خەریکبوون بە ژیانی تاك، کولتوور و ژیانی ئایینەکانی تر و وڵاتانی ئەورووپایە، ئیسلام ئایینی گشتی و دەستەجەمعییە، دوور لە هەموو نامۆیی و گۆشەگیری و تەنهاییەك. ئەم نامۆیی و بەتەنها ژیانە دەیان گرفتی دروست کردووە، بۆ نموونە زۆربەی تاکەکانی ئەمڕۆ تووشی دەیان دۆخی دەروونی بوون، هۆکاریش ئەوەیە بەتەنیا دەژین و ژیرییان لەگەڵ ئامێرێکدا هەڵسوکەوت دەکات کە کۆمەڵێك زانیاری و ڕۆشنبیری و فیکر و پرەنسیپ و خووڕەوشتی بۆ دەگوازێتەوە کە لەگەڵ ئەودا جیاواز بێت. کەواتە ئەو گەنجە بەردەوام لەگەڵ پێکدادان و دژایەتیی خۆیدا دەژی، لەگەڵ ململانێیەکدا دەژی کە بەردەوامە و درێژەی هەیە، بۆیە لە کۆتاییدا دەکەوێتە ناو دڵتەنگییەوە. ئەوەتا ڕۆژانە دەبینیت ئەو دکتۆرانەی پسپۆڕی و کاریان لایەنی دەروونییە، بەر ناکەون و نۆبەیەکی زۆر سەردانیکەریان وەستاوە. ئەوە هەمووی بەرهەم و سەرئەنجامی دەستکەوتی جیهانگیرییە و بەنەزانی گەنجی ئێمە کەوتووەتە ناویەوە.

### دەیەم: تێکەڵکرنی تایبەتمەندی و شوناس

سروشتی ئایین و میللەتان وایە بۆ هەر ئایین و میللەتێك تایبەتمەندی و جیاکاریی خۆیان هەیە لە عادات و تەقالید و کولتوور و سروشتی ژیان، بەڵام جیهانگیری لەسەر ئەوە ڕانەوەستاوە، شوناس و تایبەتمەندیی نێوان میللەتانی تێکەڵ کردووە. دامەزراوەی پرەنسیپ باسێکە و گرنگیی خۆی هەیە و دەبێت لەبەرچاو

بگیرێت، هەموو میللەتێك دامەزراوەیەکی پرەنسیپ و بەها و خوورەوشتی هەیە، دامەزراوەیەکی بەها و بایەخی کۆمەڵایەتیی هەیە، دامەزراوەیەکی بەهای فیکری و کولتووریی هەیە، ئێستا دامەزراوەکان تێك چوون، سنوور لە ڕووی خوورەوشت و پرەنسیپ و فیکر و کولتوور و شوناس نەماوە و تێکەڵی کردوون. جیهانگیری ئاوای لە جیهان کردووە هەمووی بەتێکەڵی بهێڵێتەوە، هیچ میللەتێك و هیچ تاکێك و هیچ خێزانێك نەتوانێت کەسایەتی و تایبەتمەندیی خۆی و شوناسی خۆی بپارێزێت کە ئەمە زۆر زۆر ترسناکە.

**یازدەیەم: گۆڕینی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی**

دامەزراوەی کۆمەڵایەتی لە ژن و ژنخوازی، لە ژن و مێرد و لە بابەتی پێکهێنانی خێزان و لە هەنگاوەکانی بوونی خێزان پێك هاتووە، پرسە و داخوازی و تەواوکارییەکانی دیکەی، ئەوانەی هەموو شێواندووە و شڵەژاندوونی، بۆیە دەبینیت ڕێژەی تەڵاق و لە یەك دابڕان و هەڵوەشانەوەی خێزان زۆرە. ئەوە ئاڵۆزییەکی زۆری خستووەتە ناو ژینگەی مرۆڤەکانەوە. لەبەرانبەر تێکدانی خێزان و گۆڕینی شیرازەی کۆمەڵایەتی، هاوڕەگەزبازیی کردووەتە جێگرەوەی. هەوڵی ڕازیکردنی جیهان دەدات تا لەبریی خێزان، هاوڕەگەزبازی برەو پێ بدات. بۆیە لە ڕووی یاساییەوە لە دەیان وڵات بەفەرمی یاسای بۆ دەرکردووە و بە ئاسایی داناوە.

**دوازدەیەم: ڕەشکردنەوەی گەلان**

خاڵێکی دیکە کە زۆر نەرێنییە، بریتییە لە ڕەشکردنەوەی گەلان. جیهانگیری خەریکە گەلان بەتەواوی ڕەش دەکاتەوە، بۆ نموونە ئێستا خەڵك پێی وایە هەموو دنیا ئەمەریکا و ئینگلیزن، چونکە ئەوان زیاتر بەسەر جیهاندا باڵادەستن. چەندان میللەتی تر لە دنیادا هەن کە هەر ناویان هەیە و بوون و هێزیان نییە، بۆ ئەوەش دیسان هەر جیهانگیری وای کردووە.

**سیازدەیەم: بۆشایی نێوان چینوتوێژەکانی کۆمەڵگە**

بۆشایی و نێوانێکی زۆر گەورەی لەنێوان چینوتوێژەکانی کۆمەڵگا دروست کردووە، بۆ نموونە کۆمەڵگە بەسەر چەند چینێکدا دابەش بووە، چینێك هەیە هەژارە و چینێك هەیە ناوەڕاستە و چینێك دەوڵەمەندە، ئەم چەند چینەی کە لەناو هەموو کۆمەڵگایەکدا هەن، جیهانگیری هاتووە ئەوەی تێکی داون، چینێکی زۆر هەژارونەداری دروست کردووە، چینێکیشی هەڵکشاندووە و بردوویەتە سەری سەرەوە. ئەمەش دیسان ڕێسای بەندایەتی دروست دەکاتەوە، واتە خەڵك بەرەو کۆیلەبوون دەڕوات، لە کاتێکدا ئیسلام دەیان هەنگاوی گرنگی داناوە تا کۆیلایەتی بنبڕ بکات و کۆتایی پێ بێت، ئەوان بەم هەنگاوانە جارێکی تر بەندایەتی و پرۆسەی بەبەندایەتیکردن دروست دەکەنەوە، چونکە بە هۆکاری نەتوانینی درێژەدان و بەردەوامیدان بە ژیان دەبنەوە بە بەندە و کۆیلە.

**چواردەیەم: زیادبوونی ڕێژەی هەژاری**

لەم خاڵە نەرێنییە سەرئەنجام و دەرهاویشتەیەکیش هەیە، ئەویش دەرهاویشتەی هەژارییە.

لەم دنیای جیهانگیرییەدا بەڵێ بەرهەم زیادی کردووە، بەڵام دەرهاویشتەش زیادی کردووە، بۆ نموونە ئەگەر جاران برنج ساڵانە یەك ملیۆن تەن بەرهەمی هەبایە، ئێستا لەوانەیە دە ملیۆن تەن بەرهەمی هەبێت، بەڵام هەژاری و بێکاری زیادی کردووە. گەر ئیشکردن بۆ هەموو تاکەکان لە هەر دێ و شار و وڵاتێك هەبووایە، ئێستا بەپێچەوانەوە هەژاری و بێکاری یەکجار زۆر زیادی کردووە، چونکە جیهانگیری هەموو شتی بەئەلیکترۆنی کردووە و بواری نەهێشتووەتەوە و زۆر شتی قۆرخ کردووە.

### پازدەیەم: ڕەشکردنەوەی زمان

هەموو میللەتێك وەك سروشت حەز دەكات مومارەسەی زمانی خۆی بكات، وەك ئەوەی حەزیش دەكات مومارەسەی كولتوور و ڕۆشنبیری و شوناسی خۆی بكات، جیهانگیری لەبەر ئەوەی ئاڕاستەكەی لەلایەن ئەمەریكا و ئەورووپاوەیە، وەك ئەوە وایە لە دنیادا تەنها زمانی ئەمەریكی و ئینگلیزی هەبن و تەواوی زمانەكانی تر فەرامۆش كراون. بە پێی سەرژمێری شەش هەزار زمان لە دنیادا هەن، ئێستا زمانێك و دوو زمان یان سێ زمان ڕۆڵیان هەیە.

### شازدەیەم: زاڵبوونی وڵاتە زلهێزەكان بەسەر وڵاتە بێهێزەكاندا

سەردەمانێك وڵاتانی گەورە و ئیمپڕاتۆری وەك فارس و ڕۆم و یۆنان هەبوون، لە هەمان كاتیشدا وڵاتانی بچووكی وەك جەزیرەی عەرەب هەبوون كە كولتوور و شوناسی خۆیان پارێزراو بوو، ئێستا بە هۆی ئەوەی لە ڕێگەی جیهانگیرییەوە وڵاتە زلهێزەكان دەستیان بەسەر ئابووریی وڵاتاندا گرتووە، داهات و سامان و شتومەك و پێویستیی هەموو وڵاتە بچووكەكان كەوتوونەتە دەست وڵاتە زلهێزەكان، بە هۆكاری ئابووری و دەسەڵاتێكی بەهێز، ئەمەش وای كردووە كە دەوڵە زلهێزەكان بە واتای وشە كۆنترۆڵی دەوڵەتە هەژارونەدار و لێقەوماوەكان بكەن.

ئەمانە ئەو كۆمەڵە خاڵە نەرێنیییانە بوون كە جیهانگیری هێناونی. ئەی گەنج! ژیر بە، عاقڵ بە، دانا بە، هۆشیار بە، بۆ ئەوەی ئەرێنییەكان بۆ خۆت ڕابكێشیت، بەڵام ئەگەر نەزان بیت و خۆتت ئامادە نەكردبێت و خۆتت ڕانەهێنابێت و زانیاریی باشت پەیدا نەكردبێت، ئەوا دەكەویتە ناو ئەم نەرێنییە مەترسیدارانەی كە باسمان كردن و كەسایەتیت دەتوێتەوە و لە كۆتاییدا زیانێكی زۆر بە خۆت و خێزان و دۆخ و پێگەی كۆمەڵایەتیت دەگات.

**تەوەری چوارەم: خۆرۆشنبیرکردنی گەنج**

دوای دیاریکردنی خاڵە ئەرێنی و نەرێنییەکانی جیهانگیری، پێویستمان بە هەنگاوێکی گرنگە، ئەویش ڕۆشنبیرکردنی گەنجانمانە کە بەهێزترین و گرنگترین توێژی ناو کۆمەڵگان.

لەم تەوەرەدا باسەکەمان تایبەتیترە، ئەویش بریتییە لەوەی ئایا لەم جیهانەدا، لە دنیای جیهانگیریدا، گەنج چۆن خۆی ڕۆشنبیر بکات؟ وەك پێشتر گوتمان، دنیای جیهانگیری شەپۆلێکی ئەوەندە بەهێزە کە هەموو پێوەر و هاوکێشەکانی گۆڕیوە، ئێستا گەنج ناتوانێت وەکوو جاران بە زانیاری و بە ڕۆشنبیرییەکی نیوەناتەواو و لۆکاڵی و کەموکورتەوە هەنگاو بنێت، ناتوانێت لە ماڵ و لەناو خێزان و لە کۆمەڵگە و لە فەرمانگە و لە شوێنەکەی خۆی وەکوو جاران بەم زانیارییە کەمە و بەو ڕۆشنبیرییە کەمەی کە جاران هەیبوو؛ بێت و جێپەنجەی خۆی وەدەرخات.

ئەمە دیوێکیان، دیوێکی تری ئەم بابەتە بریتییە لەوەی ئەمڕۆ هەموو کەس و بەتایبەتی گەنج و لاو بە جۆرێك دەتوانێت ڕۆشنبیریی خۆی زیاد بکات، بە ئەندازەیەکی لێ بکات کە بتوانێت بگونجێت و لەگەڵ ئەو گەنجانەدا کە ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا توانیویانە بە هۆکاری جیهانگیریی دارایی بەتوانا بن و جێپەنجەیان لە هەموو بەشەکانی ژیاندا وەدەربخەن.

هەڵبەتە ئێمەش ئامانجمان لەم زنجیرەتەوەرەیەدا بریتییە لەوەی چۆن بتوانین گەنجانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گەنجانی موسوڵمان لە جیهانی ئیسلامیدا و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هاوشان بکەین، یان لە ئاستی گەنجانی ڕۆژئاوا بەهێزتری بکەین بە هۆکاری ئەم جیهانگیرییە، چونکە زۆر جار بە هۆکاری نەناسین و نەبوونی پێناسەی دروستی جیهانگیری، دەبینیت بەشێکی زۆر لە گەنجانمان لێی دەسڵەمنەوە و لەبەری هەڵدێن، یان ئەوەتا نایناسن، یاخود نازانن چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ جیهانگیریدا بکەن و چۆن ئاستی ڕۆشنبیری و کولتووری و فیکری و توانای زانستیی خۆیان لە جیهانگیریدا گەشە پێ بدەن.

بەڵێ، بێگومان جیهانگیری هاتووە دەروازەیەکی یەکجار فراوانی بۆ گەنج فەراهەم و بەردەست کردووە، نابێت گەنج بێئاگا و کەمتەرخەم و نووستوو بێت، پشت لە جیهانگیری بکات بە هۆی چەند قسەیەکی فڕێدراو بەوەی کاکە مەترسیدارە و زیانی هەیە و تێکت دەشکێنێت. ئێمە لە پێشدا باسی نەرێنییەکانی جیهانگیریمان کرد، بۆ ئەوەی کە بزانێت ئەو نەرێنییانەی هەیە و لێی دوور بکەوێتەوە و خۆی لێ بپارێزێت.

وشەی "ثقف" (ڕۆشنبیری) لە کردار (فعل)ی "ثلاثی" وەرگیراوە کە باس لە تێگەیشتنە، باس لە هەڵسوکەوتی مرۆڤانەیە، باس لە زیرەکی و خێرادەرککردنە، باس لە خێرایی فامکردنە، باس لەوەیە کە چۆن تۆ کەسێکی ڕاوەستاو و ڕێکوڕاست و خاوەن زانست و شارەزایی و مەعریفە و فێربوون و یاسا و بەشەکانی دیکە بیت.

واتای ڕۆشنبیری (الثقافە) کۆمەڵێك واتای زۆر ورد لەخۆی دەگرێت، کە لە ژیری و زیرەکی و خێرایی فێربوون و ئەو بابەتانە پێك هاتووە.

پێویستە گەنج زۆر زۆر وریا بێت، پەلە بکات لە فێربوون و خۆڕۆشنبیرکردن، هۆشیار و ژیر و عاقڵ بێت، لە جیهانگیری زۆر سوود وەربگرێت، چونکە هەموو دەرفەتێکی بۆ فەراهەم کردوویت.

لە ئەنجامدا بە کۆی تێگەیشتنمان لە واتا و مەبەستی ڕۆشنبیری لە ڕووی تیۆرییەوە ئەوەمان بۆ بەرجەستە دەبێت ئاستی هۆشیاری و سیاسی و مێژوویی و ژینگەیی تاکەکان بەرز و پڕ زانیاری بێت، تا دەگاتە خووڕەوشت و هەڵسوکەوت و بابەتەکانی دیکەش، هەموو ئەوانە بە بابەتی ڕۆشنبیرییەوە پەیوەستن. کەواتە ڕۆشنبیری واتە تێگەیشتنێکی فراوان و زیرەکانە و هۆشیارانە و دانایانە لە یاسا و بەڕێوەبردنی ژیان، هەروەها لە خووڕەوشت بەرانبەر بە ژیان. ئەم شارەزایی و خۆڕۆشنبیرکردنە لەم بەش و بابەتانە بەئاسانی بەردەستن بۆ هەر گەنجێك لە جیهانی جیهانگیری بیەوێت خۆی ڕۆشنبیر بکات.

بێگومان هەر گەل و میللەت و ئایینێك خاوەنی ڕۆشنبیری و کولتووری

خۆیەتی، ئێستا ململانێی قووڵی ڕۆشنبیری و کولتووری لەنێوان ڕۆشنبیری و کولتووری ئەورووپا و ڕۆشنبیری و کولتووری ئیسلامی لەئارادایە، ئەورووپا دەیەوێت ڕۆشنبیریی خۆی بە هەموو پێوەر و شێوازەکانی بەسەر ڕۆشنبیری و کولتووری ئیسلامیدا زاڵ بکات. گەنج پێویستە خۆی بە ڕۆشنبیریی ئیسلامی شارەزا بکات و سوود لە ڕۆشنبیریی ئەورووپا وەربگرێت، ئەوانەی شوناسی تاکی گەنج ناخەنە مەترسییەوە.

مەبەستمان لە ڕۆشنبیری و کولتووری ئیسلامی ئەو کەسایەتییە موسوڵمانەیە کە لەسەر بنچینەی تێڕوانین بۆ ژیان و بوونەوەر و مرۆڤ لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی و هەروەها بەرجەستەکردنی ئەم شەریعەتە و خووڕەوشتێکی ڕێك و ڕاست و ڕاوەستاو سەرچاوەکەی بریتیی بێت لە کۆمەڵێك بنەمای بنچینەیی.

### هەنگاوەکانی خۆڕۆشنبیرکردنی گەنجان

ڕۆشنبیریی بەشە جیاوازەکانی ژیان جیاوازن، بۆ هەر بەشێك لە ژیان ڕۆشنبیریی تایبەت هەیە، گەنج بۆ خۆدەوڵەمەندکردن لە سەردەمی جیهانگیری لە تەواوی بەشەکانی ژیان پێویستی بە زانیاری هەیە، تا گەنجێکی وریا و ژیر و کارامەی لێ دەربچێت. ئامرازی ئەمڕۆ هەموو بوارێکی ڕۆشنبیریی بۆ گەنجەکانمان فەراهەم کردووە، جاران تاکێك بیویستبایە شارەزایی لە هەر بوارێك پەیدا بکردبایە، پێویستی بە کتێب یان سەفەرێکی دوورودرێژ بۆ لای زانا و دانایەك هەبوو تا ئەم ڕۆشنبیرییەی دەست دەکەوت، ئێستا هەموو کتێب و نووسراو و لێکۆڵینەوە و سەرجەم پێداویستیی ڕۆشنبیری لەلای گەنج بەردەستە و هاتووەتە ماڵەوە، تەنها هەوڵی دەوێت.

تاك تا ڕۆشنبیر بێت، زیاتر خزمەتی پێ دەکرێت. جیهانگیری ئەم بوارە ڕۆشنبیرییانەی بۆ گەنج فەراهەم کردووە، دەتوانێت لە یەك کاتدا لە بواری پزیشکی و ئەندازیاری و کۆمەڵایەتی و فیکری و فەلسەفی و شارستانیەت و تەکنەلۆژیای سەردەم ڕۆشنبیر بێت. ئەم گەنجە بەم پانتاییە ڕۆشنبیرییە دەبێتە دەریایەك لە خزمەت و زانیاری. کەواتە کاتێك مرۆڤ مەعریفە و زانیارییەکی

گشتی لە هەموو بوارەکاندا کۆ دەکاتەوە و لە بابەتێکی تایبەتیشدا پسپۆڕیی هەیە، پێی دەگوترێت کەسێکی ڕۆشنبیر.

### ئاستە جیاوازەکانی گەنج

بەسروشت مرۆڤەکان ئاست و پێگە و توانایان لێک جیاوازە، بە هەمان شێوە تێگەیشتن و پێگەیشتن و وەرگرتنی زانیارییش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت. بە پێی ئەم لێکدانەوەیە بۆ کۆمەڵگە، مرۆڤەکان بەسەر چەند ئاستێکدا دابەش دەبن، ئەم ئاستانە وای کردووە توانای کەسەکان جیاواز بن، بۆ هەر ئاستێکیش ڕێژەیەك لە تاکەکانی کۆمەڵگا هەیە، گەنجیش لەم ڕێژە و ئاستانە بەدەر نییە، چونکە گەنج بەشێك لە کۆمەڵگایە.

ئاستی یەکەم: ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە هەر سەردەم و زەمانێکدا بن، دەتوانن زانست و زانیاری لە بوارە جیاوازەکاندا وەربگرن و دواتر سوودی لی ببینن. ئەمە ئاستێکی بەرزە و پێی دەڵێن ئاستی یەکەم.

ئەم ئاستە لە چوارچێوەی ماهیەتی بابەتەکان و مەیدانەکانی مەعریفە زانیاری کۆ دەکاتەوە، تا ئاستی زانیاری و ڕۆشنبیریی خۆی بەرز دەکاتەوە. ئەمە پێی دەڵێن بواری مەعریفی.

لەم بواری مەعریفییەدا کەسەکە زانیاری کۆ دەکاتەوە و لەلای خۆی هەڵیاندەگرێت، بەڵام لەوانەیە نەتوانێت شیکاریی بۆ بکات، نەتوانێت بیداتەوە، نەتوانێت بە شێوازێك لە شێوازەکان ڕەنگ بداتەوە، کەواتە لە زەینی خۆیدا هەڵیدەگرێت.

ئاستی دووەم: ئەم ئاستە لە ئاستی یەکەمەوە نزیکە و دەتوانێت سوود لە جیهانگیری وەربگرێت و خۆی پێ ڕۆشنبیر بکات، جیاوازییەکەی هەر ئەوەیە دەتوانێت لە یەك کاتدا زانیاریی جیاواز لە زانست و زانیاری و کولتوور و ڕۆشنبیری وەربگرێت. کەسێکی هەمەلایەن و ڕۆشنبیر دەبێت.

ئاستی سێیەم: ئەمرۆ ململانێی هۆشیاری و زانست و زانیارییە. هۆشیاری و

ڕۆشنبیرییش دوو چەکی هاوتا و تێهەڵکێشن. لە ئاستی سێیەم گەنج دەتوانێت ئەو زانیارییەی کۆی کردووەتەوە و بەدەستی هێناوە، گرفتی خۆی پێ چارەسەر بکات و هۆشیارییەکی تەواویشی تێدا بەدەست بهێنێت. تاك چەندە هۆشیار بێت، ئەوەندە زیاتر گەشە دەکات. دەوڵەت چەندە هۆشیار بێت، ئەوەندە زیاتر گەشە دەکات. بۆیە لە ئاستی سێیەمدا لە بواری مەعریفیدا گەنج دەتوانێت ئەوەندە زانیاری کۆ بکاتەوە، پاش کۆکردنەوەی زانیارییەکانی؛ چارەسەری گرفتەکانی پێ بکات، جا ئیتر گرفتی تاك یان خێزان بێت، گرفتی کۆمەڵایەتی یان بوارەکانی تر بێت، گرفتی دەوڵەتداری، یان گرفتی وەزارەت، یان فەرمانگە یان بواری تەکنەلۆژی بێت، واتە گەنج ئەوەندە توانای چارەسەری گرفتەکانی هەیە و لە ئاستی ئەم بەرپرسیاریەتییەدایە.

ئاستی چوارەم: قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان، شیکاریی زانستی و داهێنان و نوێگەرییە. لەم قۆناغەدا گەنج دەتوانێت بەو زانست و زانیارییەی هەیەتی، شیکاریی واقیعەکەی پێ بکات و دواتر لە بواری جێبەجێکردن داهێنانی پێ بکات.

گەنجان لە وڵاتانی ئەورووپی لەم ئاستەدا دەستیان لە داهێنانی زۆر لە بوارە تەکنەلۆژی و ئامێرە سەردەمییەکاندا هەیە. بەداخەوە گەنجانی ئێمە نەیانتوانیوە ئەم هەموو دەرفەتە بقۆزنەوە و سوودی لێ وەربگرن، بەشی زۆری کاتەکانیان بە تەکنەلۆژیای سەردەم بەفیڕۆ دەدەن، یان بڵێین دەرفەتیان بۆ نەڕەخساوە، نە حکومەت و کۆمپانیاکان، نە سەرمایەدار و دامودەزگاکانی حکومەت.

هەندێک جاریش بە ناو و بیانووی جیاواز و لەبەر نەرێنییەکانی، دنیای تەکنەلۆژیامان بەجێ هێشتووە. بۆیە هەندێک کەس تا ئێستاش لەم سەردەمەدا لە ترسی دنیای جیهانگیری چووەتە ماڵەکەی خۆیەوە و دەرگای لەسەر خۆی داخستووە و کەناڵەکانی تەلەڤزیۆن و ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئەو بەشانەی جیهانگیری هێناونی، هەر هەمووی داخستووە، لەبەر ئەوەیە لە کۆتاییدا منداڵەکانی گۆشەگیر و پەرگیر و بێچارە دەردەچن، یان کەنارگیرە و ناتوانێت بێتە ناو خەڵك، ناتوانێت لەگەڵ خەڵکدا هەڵبکات، ناتوانێت بە هیچ هەنگاوێك لەگەڵ ئەو واقیعەدا هەڵبکات، بێگومان ئەو دایك و باوکەی کە بەو پەروەردە هەڵەیە

پەروەردەیان کردووە هۆکار بوون. لەوانەیە بۆ لەبەرکردنی قورئان بەهێز بوویێت، لەوانەیە لە خوێندنەوەی چەند کتێبێك بەهێز بوویێت، بەڵام نەك لە بەشەکانی تردا، ئەو گەنجە گۆشەگیر کراوە و لە زۆرێك پێویستییەکانی ژیاری و هەنووکەیی بێئاگا کراوە، چونکە نەیتوانیوە لەو ئاستەی دابنێت کە دەبوو شیاوی بێت.

ئاستی پێنجەم و کۆتایی: ئەم ئاستە لە هەموو ئاستەکانی تر بەرزتر و بەتواناترە. تەواوی توانا و ئاستەکانی پێشووی لەخۆ گرتووە، لەسەرووی ئەوەوە لە کۆمپانیا و کارخانەکان دەتوانێت بیڵێتەوە و بیگەیەنێت و حوکم و هەڵسەنگاندن لەسەر شتەکان بدات، بە ئەندازەیەك مەعریفە و زاست تێکەڵ دەکات، وەك کەسێکی کامڵ و سەرکەوتوو دەردەکەوێت، یان بڵێین دەچێتە ئاستی سەرکردە.

ئەو پێنج ئاستە زۆر بەئاسانی و سروشتی تاکی گەنج دەتوانێت لە دنیای جیهانگیری وەریبگرێت، کەواتە ئەی گەنج، خێرا کە و بڕیار بدە و خۆت یەکلایی بکەوە و وەریبگرە.

### کارامەییەکان

لە پێشدا کۆمەڵێك تایبەتمەندی و بابەتمان لە بواری مەعریفیدا باس کردووە، ئێستا دێینە سەر کارامەییەکان (مەهارات).

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کارامەیی ڕۆڵێکی گەورە لە دنیای جیهانگیریدا دەبینێت. کارامەیی سیفەتێکی لکاوە بە گەنجەوە، گەنجان حەوجێی کارامەیین لە بوارە جیاوازەکانی گەشەپێدانی مرۆیی و سەرکردایەتیکردن و بڕیاردان و کارگێڕی و سیاسەتکردن و فیکری سیاسی و ڕێگاکانی وانەگوتنەوە و تەواوی بابەتەکانی تر. کارامەیی بەشێکە لە داهێنان، بەتایبەتی گەنجان پێویستیان بە کارامەیی لە بوارەکانی ئامێرە سەردەمییەکان و ئەلکترۆنییەکانی وەك ئینتەرنێت و سۆشیالمیدیا هەیە، چونکە ئەمانە بوونەتە دەرگای پێشکەوتن و کارامەیی و داهێنان و خۆدەوڵەمەندکردن و بازرگانیی سەردەم.

## هەنگاوەکانی کارامەیی

دنیا بەرهەمی ماندووبوون و کارکردنە، ئەمە سوننەتی ژیانە و یاسای خوداییە، ئەوەی دەستی پێوە بگرێت؛ بەئەنجام دەگات، ئەوەی پشتی تێ بکات؛ ناگاتە مەبەست. کارامەیی پێویستی بە هەوڵ و کۆششی جیاواز و ماندووبوون هەیە، بەڵام ئەمرۆ بە هۆکاری ئامرازی جیاواز و ئامێرەکانی کە جیهانگیری بۆی فەراهەم کردووین؛ ئاسانتر بووە. جیهانگیری چەندان ڕێگە و ڕێباز و هەنگاوی جیاوازی بۆ فەراهەم کردووین، بۆ بوون بە کەسێکی کارامە هەر گەنجێك ئەم دەرفەتانەی لەپێشە تا ببێتە کارامە و سوود لە دەرفەتی جیهانگیری وەربگرێت.

### دەرفەتی یەکەم: فەراهەمکردنی بوارە جیاوازەکانی تەکنەلۆژیای سەردەم بۆ هەموو تاکێك

ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی جیهانگیری، تەکنەلۆژیای سەردەمی بۆ هەموو تاکێك فەراهەم کردووە بەبێ جیاوازی، تاکەکە ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەڵاتی بێت، موسوڵمان یان ناموسوڵمان بێت، واتە هەمووان دەتوانن ٢٤ کاتژمێر زانیاری لە بوارێکدا کۆ بکەنەوە تا تێیدا ببن بە کەسێکی کارامە و پسپۆڕ.

### دەرفەتی دووەم: مانگە دەستکردەکان

مانگی دەستکرد ئامێرێکە مرۆڤ دروستی کردووە، دەنێردرێتە بۆشایی ئاسمان و دەوری زەوی و هەسارەکان، بۆ ئەوەی چەندین زانیاری و کاری گرنگ ئەنجام بدات، هەروەها وێنەگرتنی کۆی زەوی و هەسارە و ئەستێرەکان، تا زانایان لەم ڕێگەیەوە بتوانن لە یاساوڕێساکانی بوونەوەر تێبگەن، هەروەها بۆ پەیوەندی و گەیاندن لە تەواوی جیهاندا بەکار دێت. بە هۆی ئەم ئامێرەوە زانیارییە نەبیستراو و

نەبینراوەکانی بوونەوەر و گۆی زەوی دەگاتە دەستی مرۆڤ. پەیوەندی و هۆکارەکانی گەیاندن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و خۆڕۆشنبیرکردنی گەنج زۆر زۆر پێویستە، بەم ئامێرانە گەنج دەتوانێت زانیارییەکی بێسنوور بەدەست بهێنێت. زانیاریی چوار کیشوەری ئاسیا و ئەورووپا و ئەمەریکا و ئەفەریقا بە هۆکاری گەیاندن و پەیوەندیکردن لەبەر دەستی گەنجدایە لە هەموو بوارەکاندا. کارامەیی لە بوارە جیاجیاکانی ژیان، وەك گەشەپێدانی مرۆیی، یان سەرکردایەتیکردن، یان بوارە ئەکادیمییەکان، یان بارە زانستی و پیشەییەکان، هەمووی لە ڕێی سۆشیالمیدیا و تۆڕی کۆمەڵایەتی و ئامرازە جیاوازەکانی وەك یوتیوب و بابەتەکانی تر وەك مامۆستایەك و قوتابخانەیەك لەبەر دەستدایە.

بۆ نموونە: بواری خواردن ئامادەکردن، هەر خواردنێکی جیاوازت دەوێت؛ خواردنی تورکی، عەرەبی و کوردی و ئەوانی تر، لە ڕێی ئامێری سەردەمەوە لەبەر دەستی هەردوو ڕەگەزدایە. بواری ژینگە و پێشکەوتنی شارستانیەت و جوگرافیای وڵاتان، هەمووی لەبەر دەستە. زانیارییەکت لە بارەی ئۆتۆمبێلەوە دەوێت، زانیارییەکت لە بارەی حەیێکەوە دەوێت، لە بارەی ئامێرێکەوە کە کڕیوتە و ناتوانیت کاری پێ بکەیت، لە ماڵەوە تەلەفزیۆنەکەت، کەناڵەکەت، گرفتێکت بۆ هاتووەتە پێشەوە، بچۆ سەر یوتیوب و داوای ئەو شتە بکە کە دەتەوێت، یەکڕاست دەبێتە مامۆستا و دێتە ماڵەکەی خۆتەوە و لەوێوە فێرت دەکات. کۆدێکت لێ بزر بووە، پێت دەدات و شێوازی دانانی کۆدت فێر دەکات. هەر جۆرە بەرنامەیەکت بۆ کۆمپیوتەرەکەت پێویستە، لەبەر دەستە. هەر بابەتێکت دەوێت، ڕێك داوای بکە و ئەویش زانیاریت پێ دەدات. کەواتە جیهانگیری بووەتە مامۆستا بۆ گەنج.

لە بواری سایکۆلۆژییەوە کە بابەتێکی زۆر هەستیار و گرنگە، دەتوانیت هەمووی لە دنیای جیهانگیریدا وەربگریت.

مرۆڤ بەسروشت پێویستی بە یاسا هەیە؛ یاسای تاك، یاسای خێزان، یاسای کۆمەڵایەتی و یاسای نێودەوڵەتی، جیهانگیری یاسای هەموو دنیای بۆ هێناویتە بەردەست و ڕێنماییت دەکات چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ یاسا جیهانییەکاندا بکەیت. بۆ نموونە تۆ بتەوێت حیزبێك دروست بکەیت، ڕێکخراوێك دروست بکەیت،

بەئاسانی جیهانگیری پانتایی ئەو یاسایانەت پێ دەدات و پێت دەڵێت چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو یاسایانەدا بکەیت.

هەڵسوکەوتی کەسی، ئەتەکێتی ژیان، ئەتەکێتی هەستان، دانیشتن، ڕۆیشتن، کاتێك دەتەوێت بۆ وڵاتێك سەفەر بکەیت، ئەتەکێتی ئەو وڵاتە چۆنە، فرۆکەخانەی ئەو وڵاتە چۆنە، چوونەژوورەوەی ئەو وڵاتە چۆنە، هەموویت پێ دەدات. کەواتە ئەی گەنج، جیهانگیری زۆر شتی پێ داویت، بەردەوام بە، لەگەڵیدا هەنگاو بنێ.

هەموو ڕۆژێك لە جیهانگیری واتا و چەمك و زاراوە فێر دەبیت، ئایا ناپرسیت کێ ئەو زاراوە و چەمکانەی بە تۆ داوە؟ بێگومان جیهانگیری. ئاگادار بە و ئاگات لێ بێت ڕۆشنبیریی ئایینی زۆر گرنگە، بۆ نموونە ئەمڕۆ بە هۆکاری جیهانگیری دەزانیت هیندۆس چ ئایینێکیان هەیە و چۆن دینداری دەکەن. هەروەها وڵاتانی ڕەشپێست، ئەفەریقی، هەروەها وڵاتانی وەك چین کە کۆنفۆشیۆسییە، وڵاتانی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و ڕووسیای ئێستا، لیبراڵیەت و شیوعیەت و مارکسیەت و ئەم بابەتانە، هەمووی جیهانگیری زانیاریت لەسەریان پێ دەدات. کەواتە ئەم دنیای جیهانگیرییە دەرگایەکی زۆر گەورەیە و لە تۆ کراوەتەوە، بەڵام لێرەدا دەرفەت کەمە و ناتوانین زۆر درێژەی پێ بدەین، بەوەندە کۆتایی بەم دەرفەتەی ئامێری مانگی دەستکرد دەهێنین.

## چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ جیهانگیریدا بکەین، یان چۆن سوودی لێ وەربگرین؟

شێوازی سوودوەرگرتن لە جیهانگیری لەم قۆناغەدا جیاوازە، بەتایبەتی لە ڕووە ڕۆشنبیرییەکەیەوە:

یەکەم: هۆشیاری و ئاگاداربوون لە ڕەوڕەوەی هاتنی جیهانگیری و کات و شوێن و مێژووی و هۆکار و پاڵنەرەکانی جیهانگیری، زۆر گرنگە هەموو تاکێك ئەم زانیارییانەی هەبێت تا بتوانێت هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات.

دووەم: سوود و قازانجی جیهانگیری و خراپە و زیانەکانی جیهانگیری لێك بکەیتەوە و بیانزانیت، لە شەڕی پارێزراو دەبیت و لە سوودەکانی سوودمەند دەبیت.

سێیەم: گەنج نابێت ڕکابەری و تێکگیران لەگەڵ جیهانگیریدا بکات و ڕووبەڕووی ببێتەوە. دوو جۆر تیگکیران لەگەڵ جیهانگیریدا هەیە: ڕێگای یەکەم: خۆگۆشەگیرکردن و پەرگیری و هەڵاتن لەبەر دنیای جیهانگیری و ئامێر و دەستوپێوەندەکانی، ئەوە لە هەموو سوودەکانی جیهانگیری بێبەش دەبیت.

بەشێك لە مامۆستایانی ئایینی زۆر ئاشنا نین بە دنیای جیهانگیری، بەردەوام لەگەڵیدا تێك دەگیرێن و هیچ کەڵکێکیش لە بواری جیهانگیری نابینن و ناشتوانن لەگەڵیدا هەڵبکەن، لە کاتێکدا جیهانگیری کاریگەریی لەسەر هەموو هەنگاوەکانی بانگەواز و فەتوا و هەنگاوەکانی ژیانی مامۆستایان هەیە. مامۆستام بینیوە منداڵەکانی لە هەموو ئامێرە سەردەمییەکان بێبەش کردووە، بە حسابی خۆی لە دنیای هاوچەرخ و ئامێرەکانی جیهانگیری دەیانپارێزێت و بە شێوازێکی ئیسلامییانە پەروەردەیان دەکات، دواتر منداڵەکانم بینیوە وەك گیانداری کێوییان لێ هاتووە، ناتوانن لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەیاندا بڕۆن، لەگەڵ دەوروبەریاندا نامۆن، هیچ لە ڕۆشنبیریی سەردەم نازانن.

ڕێگای دووەم: لەگەڵ جیهانگیری تێکەڵ دەبێت و سوودەکانی وەردەگرێت و خۆی لە خراپەکانی بە پێی توانا دەپارێزێت.

چوارەم: جیهانگیری بەردەوام داوای ژیری و گەشەکردن و بەرهەمهێنانت لی دەکات، بە هۆی ئەوەی دنیای خێرا کردووە و گەشەی ئابووریی زۆر بەهێز کردووە، ئەم گەشە ئابوورییە بواری ڕەخساندووە، ژیان و گوزەران و شوێنی ژیان و تەنانەت پۆشاك و کارگە و بازاڕ گەشەی بەردەوامی پێوە دیارە، لەم پێشکەوتنەدا دەرفەتی زۆری بۆ گەنج ڕەخساندووە بە کەم ڕازی نەبێت، کێبڕکێی خێرای دروست کردووە تا تاکەکان بەردەوام لە پێشکەوتن و داهێنان و گەشەسەندندا بن، ئەوەش هەمووی کاریگەری و دەرهاویشتەکانی بواری جیهانگیرییە.

پێنجەم: جیهانگیری جووڵەی ژیان و کۆمەڵگای خێرا کردووە، زانیارییەکان زیادیان کردووە، بازرگانی خێراییەکەی بە هۆی ئامێرەکانەوە بە هەزاران جار زیادی کردووە، جاران بە ساڵێك کەلوپەل دەگەیشتە وڵات، ئێستا بە چرکە و سەعاتە، ئەمە هەمووی کەڵکی جیهانگیرییە.

شەشەم: لاساییکردنەوە و چاولێکەری لە جیهانگیریدا کاڵ بووەتەوە، چونکە کەس بە زانیاریی کۆن و لاساییکردنەوە ڕازی نابێت، جیهانگیری بواری زانستی فراوان کردووە و لاساییکردنەوە و چاولێکەریی گۆشەگیر و قەتیس کردووە.

حەوتەم: داهێنان و نوێکارییەکانی ئامێرەکانی بەردەستت، یان ئامێرەکانی خزمەتکردن بە مرۆڤ لە بواری گەیاندن و ڕاگەیاندن و کارئاسانی کە خەریکە هەموو ژیانی مرۆڤ بە هەستەوەرەکان (لمس) کار بکات؛ ژیانی گۆڕیوە. ئەمانە دەرفەتن گەنج ببێتە خاوەنی کارامەیی کۆمەڵگا و دەوروبەر بە زانست و زانیاری و هۆشیاری و ڕۆشنبیرییەکەی سەرسام ببن.

لە کۆتایی ئەم تەوەرەدا دەڵێین بەڕاستی جیهانگیری دنیایەك و فەزایەکی فراوانی بۆ کردوویەتەوە، بۆ ئەوەی تۆ بەرەو چاکتر بڕۆیت؛ بەرەو شارستانیەتێکی گرنگتر، بەرەو ژیارێکی گرنگتر، بەرەو ڕۆشنبیرییەکی گرنگتر.

## جیهانگیری چییە؟

جیهانگیری زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی چۆنیەتیی بازرگانی و تەکنەلۆژیا، جیهانیان کردووە بە شوێنێکی زیاتر پەیوەست و وابەستەی یەکتر. هەروەها جیهانگیری لە پانتایی خۆیدا ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتییانە دەگرێتەوە کە لە ئەنجامدا هاتوونەتە ئاراوە. لەوانەیە وەك تاڵەکانی تۆڕێکی جاڵجاڵۆکەی زەبەلاح وێنا بکرێت کە بە درێژایی هەزاران ساڵ دروست بووە. ژمارە و گەیشتن بەم پێشکەوتنانە بە تێپەڕبوونی کات زیاد دەکات.

## جیهانگیری کەی دەستی پێ کرد؟

زۆرێك لە زانایان دەڵێن بە گەشتەکەی کۆلۆمبۆس بۆ جیهانی نوێ لە ساڵی ١٤٩٢، جیهانگیری دەستی پێ کردووە. پێش گەشتەکەی کۆلۆمبۆس گەشت بۆ شوێنە نزیك و دوورەکان کراوە، بەڵام لە ڕێگادا بیرۆکە و بەرهەم و دابونەریتەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکرد. ڕێگای ئاوریشم، تۆڕێکی کۆن لە ڕێگا بازرگانییەکان لە سەرانسەری چین و ئاسیای ناوەڕاست و دەریای ناوەڕاستدا کە لەنێوان ساڵانی ٥٠ی پێش زایین بەکار دەهێنرا تا ساڵی ٢٥٠ی زایینی ڕەنگە ناسراوترین نموونەی سەرەتایی بێت. وەك چۆن لەگەڵ بووژانەوەی جیهانگیریی داهاتوودا، تەکنەلۆژیا نوێیەکان ڕۆڵێکی سەرەکییان لە بازرگانیی ڕێگای ئاوریشمدا گێڕا. پێشکەوتن لە بواری کانزاسازیدا بووە هۆی دروستکردنی دراو، لە بواری گواستنەوەدا بووە هۆی دروستکردنی ڕێگاوبانەکان کە ئیمپراتۆرییەتە سەرەکییەکانی بەیەکەوە دەبەستەوە و زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵی بەو واتایە بوو کە دەتوانرا بازرگانیی زیاتری خۆراك لەنێوان ناوچەکاندا بکرێت. هاوکات لەگەڵ ئاوریشمی چینی و شووشەی ڕۆمانی و بەهاراتەکانی عەرەبی، بیرۆکەکانی وەك

بیروباوەڕی بوودایی و نهێنییەکانی دروستکردنی کاغەز لە ڕێگەی ئەم ڕیشاڵی بازرگانییەوە بڵاو بوونەوە.

بێگومان ئەم جۆرە ئاڵوگۆڕانە لە سەردەمی گەڕاندا خێراتر بوون، کاتێك گەڕیدە ئەوروپییەکان کە بەدوای ڕێگای دەریایی نوێدا بۆ بەهارات و ئاوریشمەکانی ئاسیا دەگەڕان، لەبریی ئەوە بەر ئەمەریکا کەوتن. دیسانەوە تەکنەلۆژیا ڕۆڵێکی گرنگی لە ڕێگا بازرگانییە دەریاییەکاندا هەبوو کە لەنێوان کیشوەرە کۆن و تازە دۆزراوەکاندا گەشەیان دەکرد. دیزاینی نوێی کەشتی و دروستکردنی کۆمپاس موگناتیسی، کلیلی سەرکەوتنەکانی گەڕانەکان بوون. ئێستا ئاڵوگۆڕی بازرگانی و بیرۆکە بۆ بەشێکی جیهان درێژ بووەوە کە پێشتر پەیوەندیی بەیەکەوە نەبوو.

تۆڕی جیهانگیری لە سەردەمی شۆڕشدا لە خولاندنەوە بەردەوام بوو، کاتێك بیرۆکەکان سەبارەت بە ئازادی و یەکسانی و برایەتی وەك ئاگر لە ئەمەریکاوە بۆ فەڕەنسا تا ئەمەریکای لاتین و ئەودیو بڵاو بوونەوە. سواری شەپۆلەکانی پیشەسازی و کۆلۆنیالیزم و جەنگ بوو لە سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم و بیستەمدا، کە بە داهێنانی کارگە و هێڵی ئاسن و بەلەمی هەڵم و ئۆتۆمبێل و فڕۆکە بەهێز دەکرا.

لەگەڵ سەردەمی زانیاریدا، جیهانگیری چووە ناو زیادەڕۆییەوە. پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەر و پەیوەندییەکان سەردەمێکی نوێی جیهانی دەست پێ کرد و دووبارە پێناسەی ئەوەی کردەوە کە "پەیوەندیداربوون" واتای چییە. مانگی دەستکردی پەیوەندییە مۆدێرنەکان بەو واتایە بوو کە دەتوانرێت بۆ یەکەم جار لە ئەمەریکا سەیری ئۆلۆمپیادی هاوینەی ساڵی ١٩٦٤ لە تۆکیۆ بکرێت. تۆڕی جیهانی و ئینتەرنێت ڕێگەی بە کەسێك دا لە ئەڵمانیا لە کاتی پەخشی ڕاستەوخۆدا هەواڵێکی گرنگی بۆلیڤیا بخوێنێتەوە. کەسێك کە بیەوێت لە بۆستن لە ویلایەتی ماساشوستسەوە بۆ لەندەنی ئینگلتەرا گەشت بکات، دەتوانێت بە چەند کاتژمێرێك گەشت بکات، نەك هەفتەیەك یان زیاتر کە سەد ساڵ لەمەوبەر دەیخایاند. ئەم شۆڕشە دیجیتاڵییە بە شێوەیەکی بەرفراوان

کاریگەریی لەسەر ئابووریی سەرانسەری جیهان هەبوو، ئەوان زیاتر بوون بە زانیاری و زیاتر وابەستەی یەکتر بوون. لە سەردەمی مۆدێرندا سەرکەوتن یان شکستی ئابووری لە یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی وێبی جیهانیدا، دەتوانرێت لە هەموو ئابوورییەکی گەورەی جیهاندا هەست پێ بکرێت.

## سوود و زیانەکانی جیهانگیری

## بابەتی مشتومڕی بەردەوامە

دەتوانرێت لایەنی خراپی جیهانگیری لە زیادبوونی مەترسی بۆ گواستنەوەی نەخۆشییەکانی وەك ئیبۆلا، یان نەخۆشیی توندیی هەناسەدان (SARS) ببینرێت. بێگومان جیهانگیری بووەتە هۆی باشییەکی گەورەش، گەلانی دەوڵەمەندتر ئێستا دەتوانن -و دەیکەن- بە هانای گەلانی هەژارترەوە بێن کە لە قەیراندان. زیادبوونی هەمەجۆری لە زۆرێك لە وڵاتاندا بە واتای دەرفەتی زیاتر بووە بۆ فێربوون و ئاهەنگگێڕان بە کولتوورەکانی دیکە. ئەو هەستەی کە گوندێکی جیهانی هەیە، "ئێمە"یەکی جیهانی سەری هەڵداوە.

#### ١. ئاڵوگۆڕی کولتووری و بیرکردنەوەی کراوە

یەکێك لە باشترین بەشەکانی گەشتکردن بە جیهاندا، چ بۆ کار یان بۆ خۆشی، دەستڕاگەیشتنە بە کولتوورە نوێیەکان. جیهانگیری ئاڵوگۆڕی بیرۆکە و خۆراك و موزیک و میدیا و زمان لەگەڵ فێربوونی ژیان و کارکردن لە وڵاتە جیاوازەکاندا ئاسانتر دەکات. بەتایبەتی گەشتیارانی بازرگانی دەتوانن سوود لەم زانین و قەدرزانینەی کولتوورەکانی دیکە وەربگرن. ناسین و ئەزموونکردنی کولتوورەکانی تر ئاسانتر دەکات بۆ قەبووڵکردن و باوەشکردنیان لەبریی ئەوەی وەك جیاواز سەیریان بکرێت.

**٢. زیادبوونی ڕۆیشتنی سەرمایە و دەستڕاگەیشتن بە بازاڕی هەمەچەشنتر**

کۆمپانیا جیهانییەکان دەتوانن بچنە ناو بازاڕەکانەوە کە پێشتر دەستیان لێ نەدراوە، ئەمەش سوودێکت پێ دەبەخشێت، ئەگەر بتوانیت شوێنێکی تایبەت پڕ بکەیتەوە کە پێشتر نوێنەرایەتی نەکراوە.

هەمەچەشنکردنی بازاڕەکەت یەکێکە لە باشترین ڕێگاکان بۆ گەشەکردن لە ئابووریی جیهانیی ئێستادا. تا زیاتر لە جیهاندا بڵاو ببیتەوە، بازاڕەکانی زیاتر بەردەست دەبن.

**٣. بەرهەمی باشتر بە نرخێکی کەمتر**

پاڵنەرێکی باوی بزوێنەری جیهانگیری، خواستی دۆزینەوەی شێوازی بەرهەمهێنانی کەم تێچوونە. زیادبوونی کێبڕکێی جیهانی نرخەکان دادەبەزێنێت، ئەمەش وا دەکات ئاسانتر ئەو پاشەکەوتانە بۆ بەکارهێنەران بگوازرێتەوە.

**٤. هاوبەشکردنی زانیاری و تەکنەلۆژیا**

جیهانگیری وا دەکات کە زانیارییەکانی بازرگانی دەتوانن لە سەرانسەری جیهاندا بەخێرایی بڵاو ببنەوە. تەکنەلۆژیا هەموومان بەبەردەوامی بەیەکەوە دەهێڵێتەوە، بۆیە دەتوانین لە چرکەیەکدا هەر شتێك لە خاوەندارێتیی فیکرییەوە تا دۆزینەوە زانستییەکان هاوبەشی بکەین.

**٥. هێزی کاری کالیبەری بەرزتر**

پێش جیهانگیری، بەکرێگرتن بۆ خاوەن کارەکان سنووردار بوو، پاش جیهانگیری، واتە ئێستا دەتوانن کارمەندانی ئاست بەرز لە سەرانسەری جیهانەوە دابمەزرێنن. ئیتر سنوور و مەودای دوور لە دۆزینەوەی کەسێکی بەتوانا بۆ کارەکە ڕێگریت لێ ناکات.

## سوودەکانی جیهانگیری چین؟

جیهانگیری بە چەندین شێوەی جیاواز کاریگەریی لەسەر بازرگانەکان هەیە، بەڵام ئەوانەی بڕیار دەدەن فراوانکردنی نێودەوڵەتی بگرنە ئەستۆ، چەند سوودێك دەبینن، لەوانە:

### ١. دەستڕاگەیشتن بە کولتووره نوێیەکان

جیهانگیری دەستڕاگەیشتن بە کولتووری بیانیی ئاسان کردووە، لەوانە: خواردن و فیلم و مۆسیقا و هونەر. ئەم ڕۆیشتنە ئازادەی خەڵك و کاڵا و هونەر و زانیاری، هۆکارێکە بۆ ئەوەی کە دەتوانیت خواردنی تایلەندی بە شوقەکەت بگەیەنیت، گوێ لە هونەرمەندی دڵخوازت دەگریت کە بنکەکەی لە بەریتانیایە، یان فیلمێکی بۆڵیود بڵاو دەکەیتەوە.

### ٢. بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆژیا و داهێنان

زۆرێك لە وڵاتانی جیهان بەبەردەوامی لە پەیوەندیدا دەمێننەوە، بۆیە زانست و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بەخێرایی گەشت دەکات. زانینیش زۆر خێرا دەگوازرێتەوە، ئەمەش بەو واتایەیە کە ئەو پێشکەوتنە زانستییانەی لە ئاسیا بەدەست هاتوون، دەتوانن لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا لە ئەمەریکادا کار بکەن.

### ٣. کەمکردنەوەی تێچوون بۆ بەرهەمەکان

جیهانگیری ڕێگە بە کۆمپانیاکان دەدات ڕێگەی کەم تێچوونی بەرهەمهێنانی بەرهەمەکانیان بدۆزنەوە، هەروەها کێبڕکێی جیهانی زیاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخەکان و هەڵبژاردنی جۆراوجۆریی گەورەتر بۆ بەکارهێنەران دروست دەکات. کەمکردنەوەی تێچوونەکان یارمەتیی خەڵك دەدات لە هەردوو وڵاتی گەشەسەندوو و پێشتر گەشەسەندوو بە پارەیەکی کەمتر باشتر بژین.

### ٤. ئاستی باڵای ژیان لە سەرانسەری جیهاندا

گەلانی گەشەسەندوو بە هۆی جیهانگیرییەوە ئەزموونی باشتربوونی ئاستی ژیان دەکەن. بە پێی ئامارەکانی بانکی نێودەوڵەتی، هەژاریی توند لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە بە ڕێژەی ٣٥% کەمی کردووە. جگە لەوەش، ئامانجی یەکەم بریتی بوو لە کەمکردنەوەی ڕێژەی هەژاری، لە ساڵی (١٩٩٠)ەوە بۆ نیوە تا ساڵی ٢٠١٥. ئەمەش پێنج ساڵ پێش وادەی دیاریکراو بەدەست هات، واتە لە ساڵی ٢٠١٠. لە سەرانسەری لە جیهاندا نزیکەی ١,١ ملیار کەس لەو کاتەوە لە ئاستی هەژارییەکی زۆر دەرچوون.

### ٥. دەستڕاگەیشتن بە بازاڕە نوێیەکان

بازرگانەکان بەشێکی زۆر لە جیهانگیری بەدەست دەهێنن، لەوانە کڕیاری نوێ و ڕژێمی داهاتی جۆراوجۆر. ئەو کۆمپانیایانەی ئارەزووی ئەم سوودانە دەکەن، بەدوای ڕێگەی نەرم و داهێنەرانەدا بۆ گەشەپێدانی کارەکانیان لە دەرەوەی وڵات دەگەڕێن. ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی خاوەنکارانی پیشەیی (PEO)لە جاران ئاسانتر و بەخێرایی بۆ دامەزراندنی کرێکاران لە وڵاتانی دیکە کار دەکەن، ئەمەش بەو واتایەیە کە بۆ زۆرێك لە کۆمپانیاکان چیتر پێویستی بە دامەزراندنی دامەزراوەیەکی بیانی بۆ فراوانکردنی دەرەوەی وڵات نییە.

### ٦. دەستڕاگەیشتن بە بەهرەی نوێ

جگە لە بازاڕە نوێیەکان، جیهانگیری ڕێگە بە کۆمپانیاکانیش دەدات بەهرەمەندی نوێ و تایبەتمەند بدۆزنەوە کە لە بازاڕی ئێستایاندا بەردەست نین. بۆ نموونە؛ جیهانگیری دەرفەت بە کۆمپانیاکان دەدات بۆ گەڕان بەدوای بەهرەی تەکنەلۆژیا لە بازاڕە گەشەسەندووەکانی وەك بەرلین یان ستۆکهۆڵمدا، دیسانەوە ئینتەرناشناڵ (PEO) ڕێگە بە کۆمپانیاکان دەدات کە بە پابەندبوون کرێکاران لە دەرەوەی وڵات دابمەزرێنن، بەبێ ئەوەی پێویست بکات دامەزراوەیەکی یاسایی دابمەزرێنن، ئەمەش دامەزراندنی لە جاران ئاسانتر دەکات.

## ئاڵنگارییەکانی جیهانگیری چین؟

لە کاتێکدا جیهانگیری چەندین سوودی هەیە، بەڵام بێئاڵنگاری نییە. ڕاپۆرتی پیشەسازیی تەکنەلۆژیا ( Velocity Globals 2020 State of Global Expansion TM:) هەندێك لە ئاستەنگە سەرەکییەکان ئاشکرا دەکات کە سەرکردەکانی تەکنەلۆژیای ئەمەریکا و بەریتانیا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە کاتێك کۆمپانیاکانیان بەجیهانی دەکەن و پێدەچێت سەرکردەکانی کۆمپانیاکانی دیکەش ڕووبەڕووی هەمان بەربەست ببنەوە.

هەندێك لەو بەربەستانەی کە کۆمپانیاکان لە کاتی چوونە جیهانیدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، بریتین لە:

### ١. دامەزراندنی نێودەوڵەتی

سەیر نییە کە ٣٠%ی سەرکردەکانی تەکنەلۆژیای ئەمەریکا و بەریتانیا دامەزراندنی نێودەوڵەتییان وەك باوترین ئاڵنگاریی خۆیان هێنایەوە. دامەزراندنی کارمەند لە سنووری نادیارەکانەوە بۆ تیمەکانی "HR" فەراهەم دەکات. یەکەم: کۆمپانیاکان پلانێك دروست دەکەن بۆ ئەوەی چۆن چاوپێکەوتن لەگەڵ کاندیدەکاندا بکەن و بەوردی پشکنین بۆ کاندیدەکان بکەن بۆ ئەوەی دڵنیا بن لەوەی کە شایستەن، لە کاتێکدا هەزاران میل لە بارەگاکان جیایان دەکاتەوە. دواتر کۆمپانیاکان پێویستە داواکارییەکانی بازاڕ بۆ مووچە و یارمەتییەکان بزانن، بۆ ئەوەی ئۆفەری کێبڕکێکارانە پێشکەش بکەن. بۆ دڵنیابوون لە دامەزراندنی سەرکەوتوو، تیمەکانی "HR" دەبێت هۆکاری ئاڵنگاریی وەك ناوچەی کات، جیاوازیی کولتووری و بەربەستی زمان بۆ دۆزینەوەی کەسێکی گونجاو بۆ کۆمپانیاکە بدۆزنەوە.

### ٢. بەڕێوەبردنی کۆچبەریی کارمەندان

ئاڵنگاریی کۆچبەری دەبێتە هۆی سەرئێشەیەکی زۆر لە ناوخۆدا، هەر بۆیە ٢٨%ی سەرکردەکانی تەکنەلۆژیای ئەمەریکا و بەریتانیا لەسەر ئەوە کۆك بوون

کـە یەکێکـە لـە ئاسـتەنگە سـەرەکییەکانیان. یاسـاکانی کۆچبـەری زۆر جـار دەگۆڕدرێن و لـە هەنـدێك وڵاتـدا دەسـتەبەرکردنی ڤیـزە بـۆ ئـەو کارمەندانـەی کـە ڕەگەزنامەیان بیانییە، لەرادەبەدەر قورسە. بۆ نموونە ئەمەریکا لە پێدانی ڤیزەی "H-1B" توندتر دەبێتەوە و بریتگزیت کۆچکردن بۆ بەریتانیا قورس دەکات.

### ٣. وەرگرتنی باج و کرێی هەناردەکردن

هەردوو سـەرکردەی تەکنـەلۆژیای ئـەمەریکا و بـەریتانیا وتوویانـە ئاڵنگارییـەکی دیکـە کـە ڕووبـەڕوویان دەبێتـەوە، بریتییـە لـە وەرگرتنـی بـاج و کرێـی هـەناردەکردن. ٢٩% هـاوڕان کـە ئەمـە ئاڵنگارییەکـە بـۆ بازرگانییـە جیهانییـەکانیان. بـۆ ئـەو کۆمپانیایانـە کـە دەیانـەوێت بەرهـەم لـە دەرەوەی وڵات بفرۆشـن، بەدەسـتهێنانی ئـەو شتانە لە دەرەوەی وڵات دەتوانێت بە پێی بازاڕ گران بێت.

### ٤. ئاڵنگاریی مووچە و پابەندبوون

یـەکێکی دیکـە لـە بەربەسـتە باوەکـانی فراوانبـوونی جیهـانی، بریتییـە لـە بەڕێوەبردنی مووچەی دەرەوەی وڵات و پاراستنی پابەندبوون بە گۆڕانی یاساکانی دامەزرانـدن و بـاج. ئـەم ئەرکـە بەڕێوەبردنـە قورسـتر دەبێـت، ئەگـەر هـەوڵ بـدەیت کارەکان لە چەندین بازاڕدا بەڕێوە ببەیت.

### ٥. لەدەستدانی ناسنامەی ڕۆشنبیری

سـەرکەوتنی هەنـدێك کولتـوور لـە سەرانسـەری جیهانـدا بـووە هـۆی ئـەوەی کـە وڵاتـانی دیکـەش ئـەو کولتوورانـە وەربگـرن، بـەڵام کاتێـك کولتوورەکـان دەسـت بە دژایەتیی یەکتر دەکەن، ئەوە سەرئەنجامی خراپی دەبێت و بەریەك دەکەون.

لـە چوارچێوەی باسـەکەماندا دوو بازنـەمان وەرگـرت و قسـەی لەسـەر دەکـەین، بازنەیەکیان بازنـەی گـەنجان و لاوانـە، بازنـەی دووەمـیش بازنـەی جیهانگیرییـە، لـە ناوەنـدی ئـەم دووەدا قسـەمان لەسـەر ئەوەیـە ئـەم گـەنج و لاوە چـۆن لـە دنیـای جیهانگیری تێبگات.

لێرەوە دێینە سەر بەشی دووەم، دەبێت گەنج بزانێت جیهانگیری چییە، هەروەها پێناسە و ئامانج و مەبەستەکانی چییە و نەرێنی و زیانەکانی چین، هەروەها کەڵك و ئەرێنییەکانی چین، گەنج پێویستی بە بەرچاوڕوونی هەیە، گەنج سامانێکی گەورەیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەم سامانە گەورەیە ناکرێت لەگەڵ ئەم پانتاییە فراوانە هەڵسوکەوت بکات کە جیهانگیرییە و بووەتە بەشێك لە ژیانی هەموومان.

ڕاستە ئەم باسانە کەمتر دەورووژێنرێن و باس دەکرێن، بەڵام ئەم بابەتانە ناوەرۆك و کاکڵەی ئەمڕۆی گەنجن، چونکە ئەمڕۆ گەنج لەم جیهانەدا بە جۆرێك لە جۆرەکان کەوتووەتە ناو شەپۆلێکەوە کە نازانێت بەرەو کوێی دەبات.

## پێناسەی جیهانگیری

لە سەدەی بیستەم و کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا، بەتەواوییش سەدەی بیستەم، جیهانگیری هاتە هەموو جیهانەوە و تا ئەمڕۆش کە قۆناغ و سەردەم و زەمانەی سەدەی بیست و یەکەمە، ڕۆژبەڕۆژ جیهانگیری گەشە دەکات. ئەم دۆخەی کە ئێستا هەیە، گەیشتووەتە ئاستی ئەوەی بووەتە زاراوەیەك، لە هەموو ڕاگەیاندنەکانەوە باس باسی جیهانگیرییە.

بێگومان بابەتی جیهانگیری چەند پێناسەیەکی هەیە، بەشێکیان دەڵێن جیهانگیری و باس لە جیهانگیری دەکەن، واتە یەکێك لەو فیکرانەی کە لە هەموو جیهاندا هاوبەش و بەشدارن، هەندێك ناویان لێ ناوە و وەرگێڕانیان کردووە بە ناوی ئەستێرە (کەوکەب)، واتە هەسارەیەکە، یان بە واتایەکی تر: ئەم ئەستێرەیە کە دیسان ئەستێرەیەکی گشتگیرە و بۆ هەموو جیهان گشتییە. هەندێکیان ناویان لێ ناوە گەردوونی، واتە بوونەوەری. بە هەر دەستەواژەیەك لەم دەستەواژانە بێت، ئێمە دەزانین کە مەبەستیان لەم بەجیهانیکردنەیە و ئینجا جیهانگیری لە هەر بوار و بەش و لایەك بێت.

ژیانی مرۆڤ ئەمڕۆ بووەتە بەشێك لە جیهانگیری. لە گوندێكدا یان لە شاردا، یان لە بازاڕدا، یان لەسەر ئینتەرنێت و تەكنەلۆژیا، لە هەر بابەتێك لەو بابەتانە بێت، مرۆڤ بەگشتی و گەنج بەتایبەتی كەوتووەتە ناو شەپۆلێكی گەورەی جیهانگیرییەوە.

لێرەدا بابەتەكە ڕوو لە گەنجە، بۆیە پێویستە بزانیت ئەی گەنج، ئاگات لێ بێت جیهانگیری دەرهاویشتەیەكی سیستم و ڕێڕەوی سەرمایەدارییە. ئاگاداریت كاتێك بلۆكی ڕۆژهەڵاتی دەڕووخێت و شیوعیەت شكست دەهێنێت، ئینجا هزری سیستمی سەرمایەداری لە جیهاندا سەر هەڵدەدات كە ئەمڕۆ ئەمەریكا و بەشێك لە وڵاتانی ئەورووپی سەرپەرشتیی دەكەن.

پرەنسیپی سەرمایەداری ماددەیە، واتە باوەڕپێهێنان و داننان تەنیا بە شتی هەستپێكراو و بەرجەستەدا، واتە جگە لە شتە بەرجەستە و هەستپێكراوەكان، هیچی دی لەلای ئەوان جێگەی بڕواپێبوون نین، لەژێر دروشمی "لا اله والحیاه مادە".

بەو پێیە بۆمان دەردەكەوێت جیهانگیری و سیستمی سەرمایەداری بڕوای تەنیا بە ماددە و میتافیزیكی هەیە، بڕوای بە بابەتەكانی دیكەی ئەودیو بەرجەستە و بەرچاو و هەستپێكراو نییە، بڕوای بە پەنهان و نادیار و خوا و هەموو نەبینراوەكان نییە. وریا بە، جیهانگیری بڕوای بە هیچ لەوانە نییە و دانیان پێدا نانێت، چونكە سەد لە سەد دەرهاویشتەی سەرمایەدارییە، باوەڕی تەنیا بە ماددیات هەیە.

## ڕەهەندەكانی جیهانگیری

جیهانگیری دەرگا و ڕەهەندی جیاوازی بۆ وڵاتانی زلهێز و خاوەن فیكرە جیاوازەكانی دنیا كردووەتەوە، تا بتوانن بیكەنە بەشێك لە غەزووی فیكری و لەوێوە كار لەسەر جیهانی ئیسلامی و گەنجان بكەن. سروشتی جیهانگیری زۆر گشتگیرە و زۆر ڕەهەند هەڵدەگرێت، بەكورتی چەند لایەن و ڕەهەندێك باس دەكەین:

### یەکەم: ڕەهەندی فیکری

بەهێزترین چەکی تەواوی ئایدۆلۆژیاکان لە جیهاندا چەکی فیکرە، بۆیە هەموو ئایدۆلۆژیاکان بە چەندان ناوەند و ئامرازی جیاواز لە جیهاندا هەوڵی بڵاوکردنەوەی دەدەن، چونکە فیکر پێناسە و سیمای ئایدۆلۆژیاکانە، هەر لە ڕێی فیکریشەوە دەتوانیت ڕەوشت و ئەخلاق و بەهای کۆمەڵگا و تاکەکان بگۆڕیت. جیهانگیری گەورەترین دەرفەتی داوەتە وڵاتان بۆ ئەوەی فیکری خۆیان بڵاو بکەنەوە، وەک وتمان بەشێك لە بیرمەندان ناویان لە جیهانگیری ناوە ئەمرەکە، چونکە ئەمەریکا لە ڕێی جیهانگیرییەوە فیکری سەرمایەداری بڵاو دەکاتەوە. جاران سنوور و بەربەستی ماددی بۆ ڕێگەگرتن لە هاتنی فیکری نامۆ بۆ وڵاتان هەبوو، ئێستا بە هۆکاری تەکنەلۆژیای سەردەم هیچ بەربەستێك نەماوە و جیهان بووەتە یەك بازنە و هەموو مرۆڤەکان تێیدا دەسووڕێنەوە.

### دووەم: ڕەهەندی سیاسی

جیهان بە هۆی سیاسەتکردنی ماکیاڤێللییەوە بووەتە ململانێ و یەکترشکاندن، بە ئەندازەیەك زلهێزەکان؛ وڵاتە تازەپێگەیشتوو و لاوازەکانیان کۆنترۆڵ کردووە. دارشتنی ستراتیژی سیاسی لە جیهانی جیهانگیری و ململانێی سیاسی و شارستانیەت و فیکر، تێڕامان و وردبوونەوەی زۆری پێویستە، چونکە ستراتیژی سیاسی واتە تێگەیشتن و داڕشتنی نەخشەی سیاسی بۆ ململانێ و گەیشتن بە دەسەڵات، وەك قول هانس مورغنتاو دەڵێت: "السياسة: صراع من أجل القوة والسيطرة[1]"، واتە: "سیاسەت ململانێیە لە پێناو هێز و زاڵبوونی دەسەڵات". هەروەها سیاسەت بە پێی پێناسەی ئینسکلۆپیدیای زانستە سیاسییەکان بریتییە لە "فن إدارة المجتمعات الانسانية[2]"، واتە: "هونەری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای

---

[1] بڕوانە: السياسة بين الأمم، هانس مورغنتاو، ص١٣.
[2] بڕوانە: موسوعة العلوم السياسة، زانکۆی کوێت، ل١٠٢، بڕگە (٧٨).

مرۆڤایـەتی". یـان وەك یاسـاییەكان دەڵـێن: "أصـول أو فـن إدارة الشـؤون العامـة[١]"، واتـە: "بنـەما و هونـەری ئیـدارەدانی كاروبـاری گشـتییە". یـان وەك ئیـبن نەجـیم دەفەرمووێت: "السیاسة: هي فعل شيء من الحاكم لمصلحة يراها وإن لم يرد بذلك الفعـل دليـل جزئـي[٢]"، واتـە: "سیاسـەت كردەوەكـانی سـەرۆكێكی وڵاتـە كە بـۆ بەرژەوەندیی گەل دەیكات، با ئەم كردەوەیە بەڵگەی جوزئیی لەسەر نەبێت". فەتحی یەكن دەڵێت: "إن السياسة تعنى فى مفهومنا الاسلامي رعاية شؤون الأمة، وبهذا يكون للسياسة مفهوم رعائى يشمل كل نواحى الحياة، ويتصل بكل جانب من جوانبها المختلفة[٣]"، واتە: "سیاسەتكردن بە تێگەیشتنی ئیسلامی واتە چاودێری و سەرپەرشتیی كاروباری ئوممەت، بەم پێوەرە سیاسەتكردن چاودێریی تەواوی بەش و لایەنە جیاوازەكانی ژیان دەكات".

كەواتـە لـە بنـەڕەتدا سیاسـەت بـۆ خزمـەتكردنی مرۆڤـە نـەك بـۆ یەكترشـكاندن، بـەڵام لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدیی نـاڕەوا ئـەمڕۆ سیاسـەت بـوغزێنراوە، وڵاتـان جیهانگیرییـان بەسیاسی كردووە، لـە كاتێكدا جیهـانگیری دیسـان فیكر و بەرهـەم و داهێنانی مرۆڤە بۆ خزمەتی مرۆڤ بەبێ جیاوازی. بەداخەوە ڕەهەندی سیاسی زۆر بەسەر جیهانگیرییەوە دیارە.

### سێیەم: ڕەهەندی كۆمەڵایەتی

هـەموو كۆمـەڵگەیـەك كۆمـەڵێـك تایبەتمەنـدی و جیـاوازیی كولتـووریی هەیـە، بەتایبەتی موسوڵمانان هەڵسوكەوتی كۆمەڵایەتییان لـە قورئـان و سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) سەرچاوەی گرتووە، لە هەموو هەنگاوە كۆمـەڵایەتییەكاندا ڕەچاوی بنەما شەرعییەكان دەكەن، تاك و خێزان و كۆمـەڵگە و هەستان و دانیشتن و سـەردان و بـازاڕ و ژن و ژنخوازییـان بـە پێـوەری شـەرعە، ئـەمڕۆ جیهـانگیری تێكەڵ بووە لەگەڵ ژیانی كۆمەڵایـەتیی ئێمـە، بـە ژیـانی تاكەكانـەوە، بـە ژیـانی

---
[١] بڕوانە: موسوعة العلوم السياسة، زانكۆی كوێت، ل١٠٢، بڕگە (٧٨).
[٢] بڕوانە: البحر الرائق، ئیبن نجیم، (٥/١١).
[٣] بڕوانە: أضواء على التجربة النيابية الاسلامية في لبنان، فتحى يكن، ص١٩.

خێزان و گوند و خوێندەوار و نەخوێندەوار و ژیانی زانکۆکان و قوتابی و تا دەگاتە تاك تاکی مامۆستا و پسپۆڕ و هەروەها لەوێوە بۆ کۆمەڵگە، هەموو پێوەرەکانی کۆمەڵگای تێك داوە، بنەما و کولتووری کۆمەڵایەتی و شیرازەی خێزانی شڵەژاندووە.

**چوارەم: ڕەهەندی تەکنەلۆژی**

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی فیکری و زانستیی فەڕەنسی، دیارترین سیمای زانستی و شارستانی و داهێنانی ئەم شۆڕشە تەکنەلۆژیا و ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانی سەردەمە. چەندان ئامێر و تەکنەلۆژیی بەرهەم هێناوە لە تەواوی بوارەکانی پزیشکی و سەربازی و ئەندازیاری و گواستنەوە و گەیاندن و پەیوەندییەکان تا دەگاتە خزمەتگوزاری بۆ مرۆڤەکان لە هەر هەموو بوارێکدا. سوودی بە هەموو جیهان گەیاندووە، ژیانی بەتەواوی گۆڕیوە، خێراییەکی بێئەندازەی بە ڕەوتی ژیان داوە، بەرهەمی زیاد کردووە و بازرگانیی جیهانی بەیەکەوە بەستووەتەوە، تاکەکانی کردووەتە خاوەنی کەناڵی سەربەخۆ، سنوور و دیواری وڵات و میللەتانی تێکەڵ کردووە، دەسەڵاتی بەزاندنەوەی تەواوی سنوورەکانی هەیە، بە دەرگای داخراوی ماڵەکانیشەوە. ئەم ڕەهەندە بەشێکی ئەرێنییە و بەشێکی نەرێنییە، وڵاتە زلهێزەکان بە هەمان شێوە ئیدارەی ئەم ڕەهەندەش لە ڕێی جیهانگیرییەوە دەکەن.

**پێنجەم: ڕەهەندی ڕۆشنبیری**

بابەتێکی تری هەستیار هەیە، ئەویش جیهانگیری ئەمڕۆ دنیای بیرمەندان و عاقڵمەندان و زانایان و ئەوانەی کە لە جیهاندا خۆیان بە نوخبە دەزانن، بە توێژینەوە لە بارەی جیهانگیرییەوە سەرقاڵ کردووە. ئایا جیهانگیری کاتێك بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هاتووە، چیی لە گەنجەکان دەوێت، چیی لە تاك دەوێت، چیی لە کۆمەڵگە و خێزان دەوێت!

بۆیە هەر لە ئەکادیمییەکان تا دەگاتە لێکۆڵەرەوەکان و توێژەرەکان و بیرمەندەکان، لە هەموو قوژبنێکی ئەم جیهانەدا خەریکن تاریف و پێناسەی جیهانگیریمان بۆ بکەن، هەروەها ئەوەشمان بۆ باس بکەن ناڕوونییەکان و

میکانیزمەکانی جیهانگیری چییە و هەروەها مەبەست و ئامانجەکانی جیهانگیری چییە و نەرێنییەکان و ئەرێنییەکانی جیهانگیری چین، ئەوانەش هەموویان لەسەر کۆمەڵگە و گەنج کە بەتایبەتی بابەتی ئەم باسەی ئێمەیە.

دەرئەنجامی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان دەریدەخەن کە بەشێك لەو لێکۆڵەر و توێژەرانە، تەرکیزیان خستووەتە سەر یەکێك لەو شێوانەی جیهانگیری، ئەویش جیهانگیریی ڕۆشنبیرییە.

مەبەست لە جیهانگیریی ڕۆشبیری، واتە جیهانگیری مەودای هەیە و ڕەهەندی هەیە؛ ڕەهەندی فیکری و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و بوارەکانی تر. ئەورووپا و ئەمەریکا و وڵاتە زلهێزەکانی دیکە کە ئیدارەی جیهانگیری دەکەن، تەرکیزیان زیاتر لەسەر بواری جیهانگیریی ڕۆشنبیرییە.

هەندێکیان کە قسە لەسەر جیهانگیریی ڕۆشنبیری دەکەن، دەڵێن وڵاتان دەیانەوێت ڕۆشنبیریی خۆیان بەسەر جیهاندا زاڵ بکەن، واتە تاکەکان لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتیان، لە بڕیاریان و لە ڕۆیشتنیان و لە جل و پۆشاکیان و لە کڕین و فرۆشتیان، لە چۆنیەتیی پێکەوەیی خێزانییان، لە پێکهێنانی خێزانیان، لە هەموو ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیی بە بواری مرۆڤەکەوە هەیە تا دەگاتە لایەنی بیروباوەڕ و فەلسەفە و فیکر، هەمووی بە ڕۆشنبیریی خۆرئاوایی و بە ڕۆشنبیریی ئەمەریکی ڕەنگ کراوە.

بەشێکیان ئەوە ڕەهەندەکەیەتی، واتە دوو لایەن و بەرە، لایەنێکیان دەڵێن بەڵێ، جیهانگیری ئەمەریکییە و دەیەوێت ڕۆشنبیریی تایبەتی خۆی لە جیهاندا بڵاو بکاتەوە و هزری خۆی بسەپێنێت. بەڵام لایەنەکەی تریان دەڵێن نەخێر، بەڵکوو جیهانگیری واتە بەجیهانیکردن، بەتایبەتی لە ڕووی ئابوورییەوە، جیهان وەکوو یەك گوند و یەك شار و لە ڕێگەی تەکنەلۆژیای سەردەمەوە بتوانن بازرگانی بکەن. دەشڵێن جیهانگیری یەکێکە لە جیهانگیریی ڕۆشنبیریی گشتی و هەر کەسێک دەتوانێ ڕۆشنبیری و جیهانگیری کاریگەریی لێ نەکات و ڕۆشنبیریی تایبەتیی خۆی بپارێزێت.

کەواتە دوو بۆچوونمان هەیە و بۆچوونێکیان دەڵێن جیهانگیرییەکی گشتگیرە و دەیەوێت تێکەڵ ببێت و خۆی بەسەر هەموو دنیادا لە ڕووی فیکر و ڕۆشنبیرییەوە بسەپێنێت، بۆچوونێکیان دەڵێن نەخێر، بەڵکوو جیهانگیری دەیەوێت دەرفەت بۆ هەموو تاکەکان بڕەخسێنێت، دەیەوێت بازرگانی بۆ هەمووان بڕەخسێنێت و دەیەوێت هەموو مرۆڤەکان پێکەوە ببەسترێنەوە، وەك ئەوەی ئەمڕۆ لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەبینرێت و هەمووان لە یەك قاڵب و لە یەك تۆڕی کۆمەڵایەتیدا یەکتر ببینن، ڕووی قسە لە یەك بکەن و لەگەڵ یەکدا گفوگۆ بکەن و یەك بدوێنن و بازرگانی و هەموو ئەوانەش لەگەڵ یەکدا ئەنجام بدەن.

ئێمە کاتێك ورد دەبینەوە و تەماشای جیهانگیریی ڕۆشنبیری دەکەین، دەبینین جیهانگیریی ڕۆشنبیری لە دوو ڕێگاوە تێکەڵ بە ژیانی مرۆڤ بووە؛ ڕێگایەکیان ئەوەیە کە ئەم بابەتانەی ئەمڕۆ هەن، ئینتەرنێت و سۆشیالمیدیا و تەواوی هۆکارەکانی پەیوەندیکردن، بوونەتە بەشێك لە ژیانی مرۆڤایەتی و هیچ کەس، دەگمەن نەبێت، ناتوانێت لەم بابەتانە داببڕێت. ڕۆژانە ئەگەر لە ئینتەرنێت و تەکنەلۆژیا دابېڕێیت، هەست دەکەیت لە ژیان دابڕاویت، لە کۆمەڵێك زانیاریی گرنگ دابڕاویت.

هەموو تاکێك ئەمڕۆ پێویستی بەوەیە زانیارییەکانی وەکوو جاران لۆکاڵی نەبن، بەڵکوو گشتگیر بن، ئەمانە پێمان دەڵێن مرۆڤەکان چوونەتە ناو جیهانگیرییەوە بەبێ ئەوەی خۆیان ویستیان لەسەر بێت، چونکە ئەمڕۆ ناتوانیت خۆت لە دنیای جیهانگیری دەرباز بکەیت، بەڵکوو بە ویستی خۆت بێت یان نا؛ کەوتوویتە ناو جیهانگیرییەوە.

بەشێك لەوانەی کە دەڵێن جیهانگیری بەجیهانیکردنی ڕۆشنبیرییەکی نوێیە لەگەڵ گەرەنتیی پاراستنی ڕۆشنبیریی تایبەتی لەلای ئەو تاك و ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئاوێتەی بووە، واتە سەرباری خاوەندارێتی بۆ ڕۆشنبیریی تایبەتی لەلایەن تاك و کۆمەڵگەوە، هەموو کۆمەڵگایەك لە دنیای جیهانگیریدا گەشە بە ڕۆشنبیریی زیاتری خۆی بدات، گەشە بە زانیاری و هزر و کولتوور و بوارەکانی دیکەی خۆی بدات.

کەواتە جیهانگیریی ڕۆشنبیری گرنگترین ڕەهەندی ئەوەیە کە چۆن بتوانێت نموونەیەکی بابەتی کە مرۆڤ ناتوانێت لێی دەرباز ببێت؛ پێشەکەش بە مرۆڤەکان بکات، ئەویش وەك گوتمان ئێستا ئینتەرنێت و بوونی پەیوەندییەکان و ئابوورییە.

ئەمڕۆ هەموو گەنجێك ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك لەگەڵ ئینتەرنێت و سۆشیالمیدیا بەسەر دەبات، لە ماڵەوە بێت یان لەناو پاسدا بێت، یان لەناو دووکان و شوێنی کاری بێت، یان لە فەرمانگە و شوێنی فەرمانبەرییەکەی بێت. لە زانکۆ و پەیمانگاشدا بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و دەستخستنی زانیاری و گەیشتن بە ئامانجەکانی، بە هەمان شێوە لە ڕێگەی گەڕانی تەکنەلۆژیی ئینتەرنێتی و سۆشیالمیدیاوەیە. جیهانگیری لەو ڕووەوە توانیویەتی خزمەتێکی یەکجار زۆر بە تۆی گەنج بکات.

ئەی گەنج، ئەوە جیهانگیرییە دەتوانێت ڕۆژانە زانیاریی وردت لە بارەی مێژووەوە پێ بدات، ئەوە جیهانگیرییە دەتوانێت ڕۆژانە زانیاریی نوێت لەسەر پزیشکی و لەسەر تەندروستیت پێ بدات، ڕۆژانە زانیاریت لەسەر بواری وەرزش و ڕووداوە وەرزشییەکان پێ بدات. جیهانگیرییە هەموو دنیای بۆ بچووک کردوویتەتەوە و وەکوو گوندێکی لێ کردووە. جیهانگیرییە ڕۆژانە زانیاریی هەموو دنیات دەخاتە بەردەست، لە ڕووی سیاسی و ئابووری و لایەنەکانی دیکەوە. ئەمە جیهانگیرییە توانیویەتی تۆ لەگەڵ کەسێکدا لە ئەورووپا پێک ببەستێتەوە، تۆ بە کەسێکەوە لە ئەمەریکا پەیوەندگیر بکات، لەگەڵ کەسێکی ئاسیایی، لەگەڵ کەسێکی ئەفەریقایی و لەگەڵ هەموو جیهاندا. جیهانگیرییە ڕێگە و دەرفەتی بە تۆ داوە کە تۆ پەرە بسێنیت و هەنگاو بنێیت و بتوانیت لە ڕێگەی خۆتەوە و لە ماڵەکەی خۆتەوە هاوبەشیی زانستی بکەیت و هاوبەشیی فیکری بکەیت و هاوبەشیی هەموو سێکتەرەکانی ژیان بکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت زۆرترین زانیاری کۆ بکەیتەوە، وردەوردە زانیاریی خۆت زیاد بکەیت و لەم شۆڕشە تەکنەلۆژییەی ئەم سەردەمەدا بەشدار بیت.

**شەشەم: ڕەهەندی ئابووری**

ڕەهەندیکی تری هەستیار و گشتگیر و پێویست، ڕەهەندی ئابوورییە لە دنیای جیهانگیری. هەڵبەت دوایین قسەمان لەسەر ئەم ناساندنە دەبێت، کە پێمان وایە جیهانگیری، وەك زانایان دەڵێن، ئاراستە و ڕوویەکە بۆ سەپاندنی نموونەیەکی ئابووری، سیاسی و ڕۆشنبیری (إتجاه لفرض نموذج إقتصادي، سياسي، ثقافي...).

جیهانگیری ئاراستەیەکە، ئەو ئاراستەیە نموونەیەکی هێناوە و خۆی سەپاندووە، سەرەتا لە ڕووی ئابوورییەوە، کە ئێستا ئابووریی جیهان ئابوورییەکی سەرمایەدارییە، بانکەکان سەرمایەدارین، بازرگانییەکانی زۆربەی دنیا لەسەر ئاستی سەرمایەداری دەکرێت، کۆمپانیاکان بە شێوازی سەرمایەداری بینا کراون، زۆربەی دەوڵەتانی زلهێزی ئەورووپا و ئەمەریکا و بەشە دەوڵەتە زلهێزەکان لەسەر بنەمای سەرمایەدارین. کەواتە کە دەڵێین جیهانگیری خۆسەپاندنێکی ئابوورییە، واتە مەبەستمان لێی سەرمایەدارییە. دەبێت بزانیت چۆن لەگەڵ سەرمایەداریدا بازرگانی دەکەیت و نەکەویتە ناو سەرمایەدارییەوە بەبێ دەرککردن و زانیاری، هەروەها دەبێت ئاگادار بیت کە سەرمایەداری گرفتێکی گەورەی سوو و سووکاریی تێدایە.

پاش ئابووری، جیهانگیریی سیاسییە، واتە جیهانگیری لە ڕووی سیاسەتەوە خۆی سەپاندووە، ئەویش پێی دەڵێن سیاسەتی سیستمی دیموکراسی. ئەوەمان لەبیر نەچێت کە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا سیستمی دیموکراسی شکستی هێناوە، بەڵام بە دوو مەبەست و تایبەتمەندی جیهانگیری هاتووە و خۆی سەپاندووە: یەکەمیان ئەوەیە ئابوورییەکی سەرمایەداریی بەسەر هەموو جیهاندا سەپاندووە، دووەمیشیان بەو جۆرەی خواستی بووە، دیموکراسیەتی بەسەر هەموو دنیادا سەپاندووە. کەواتە سیستمەکەی؛ سیستمێکی دیموکراسییە.

سێیەم ڕووی جیهانگیری، سیستمی ڕۆشنبیرییە، ئەوان دەیانەوێت بەڕاستی هەموو ڕۆشنبیرییەکانی خۆیان بگوازنەوە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا سنوورەکان نەماوە، وەکوو جاران سنووری هیچ دەوڵەتێك لە ڕووی کۆمەڵایەتی و بابەتەکانی

تـرەوە پـارێزراو نیـیە، جـاران هـەر گـەلێك تایبەتمەنـدی و نـاوازەیی خـۆی هـەبوو، کۆمەڵێك ڕەوشت و ڕۆشنبیریی خۆی هەبوو کە هـەموویان پارێزراو بـوون، ئـەویش بە هۆی داخرانی سنووری‌ك کە پێی دەگوترا سنووری جوگرافی و پێی دەگوترا سنووری ڕۆشنبیری.

ئـەمڕۆ جیهـانگیری سـنووری نەهێشـتووەتەوە، ڕۆشـنبیریی ئـەمەریکی تێکـەڵ بـووە بـە ڕۆشـنبیریی عـەرەبی، ڕۆشـنبیریی عـەرەبی تێکـەڵ بـووە بـە ڕۆشـنبیریی کـوردی، ڕۆشـنبیریی کـوردی تێکـەڵ بـووە بـە ڕۆشـنبیریی تـورکی... ئیـدی بـەو شێوەیە سنوور و جوگرافیا لەبەردەم ڕۆشنبیریدا نەماوە، هیچ شتێك نییە بەربەست بێـت بـۆ ئـەوەی لـێ نەگـەڕێت ڕۆشـنبیری بـۆ جیهـان بپەڕێتـەوە، بۆیـە ئـەمڕۆ ململانێـی لەسـەر سـەپاندنی ڕۆشـنبیرییە. فـارس دەیـەوێت ڕۆشـنبیریی خـۆی بسەپێنێت، تورك دەیەوێت خۆی بسەپێنێت، عەرەب دەیەوێت خۆی بسـەپێنێت، کـورد دەیەوێت خۆی بسپەێنێت، ئەمەریکا و ئەورووپییەکان دەیانـەوێت ڕۆشـنبیریی خۆیـان بسەپێنن.

ئەمڕۆ ململانێی گەورەی ڕۆشنبیرییە، بۆیە گەنج پێویست بەوە دەکات ئەو تایبەتمەنـدی و سلووك و ناوازەییانـە کـە خـۆی هەیـەتی؛ بیپارێزێت، ئینجا چ لـە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە بێت کە پەیوەندیی بە ژن و ژنخوازی و مـارەبڕین و تـەڵاق و میـرات و ئـەو بابەتانەوەیـە، چ لـە ڕووی خـزم و خزمایـەتی و بابەتـەکانی تـری کۆمـەڵگاوە بێت، چ لـە ڕووی کـڕین و فرۆشتنەوە بێت، یـان لـە ڕووی خـواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و ئەوانەوە بێت.

جەنگەکە جەنگی ڕۆشنبیرییە، بۆ نموونە کە دەچیتە هیند، دەبینیت وڵاتـانی ئـەورووپی دەیانـەوێت لـەوێ شـێوازێك لـە شـێوازەکانی خـواردن ئـەوە بێـت کـە ئەورووپاییەکان دەیانەوێت.

کـە وا بـوو بەباشـی حـاڵی ببـە و تێبگـە ئـەی گـەنج، ئاگـادار بـە، دەست بـە ڕۆشـنبیریی خۆتـەوە بگـرە و چـاودێریی بکـە، چـاودێریی بـوارە داراییەکـەت و چاودێریی خووڕەوشتی خۆت بکە و نەکەویتە ناو ئەو گەمە بەرفراوانەی کە هەیـە، بـەڵام بـە سـوودوەرگرتن و کـەڵکبینین لـە جیهـانی جیهـانگیری و تەکنـەلۆژیای سەردەم و شۆڕشی نوێ کە هەن.

## تەوەری شەشەم:
## گەنجی داهێنەر

ئەم بابەتە لە باس و بابەتەکانی تر بەدەر نییە کە بە گەنجەوە پەیوەستە، بەتایبەتی گەنجی داهێنەر. هەر چەندە جیهانگیری زۆر دەرفەتی بۆ گەنج ڕەخساندووە، بەڵام ئەگەر گەنج خۆی داهێنەر و خولیای داهینانی نەبێت، ناتوانێت سوود لەم دەرفەتانە وەربگرێت. هەندێک جاریش گەنج هەیە خولیای داهێنانە و سیفەتی داهێنانیشی تێدایە، بەڵام کەس نییە دەستی بگرێت، یان ڕێگای لی ون بووە، یان دەرفەتی بۆ نەڕەخساوە، لێرەوە دەمانەوێت خۆی بدۆزێتەوە، سوود لە توانا و کارامەیی خۆی وەربگرێت.

داهێنان لە سەردەمی جیهانگیریدا تا ڕادەیەك ئاسانکاریی پێوە دیارە، ململانێی داهێنانیش لە قۆناغ و سەردەمی جیهانگیریدا زۆر بەهێزە، چونکە ئەمڕۆ لە هەموو بوارەکاندا ڕۆژانە هەنگاو هەیە بۆ ئەوەی داهێنانی نوێ بکرێت.

ئەو گەنجەی کە داهێنان دەکات و توانای داهێنانی هەیە، کێیە؟

## پێناسەی گەنجی داهێنەر

گەنجی داهێنەر ئەو گەنجەیە خاوەنی دید و هێز و تۆکمەیی و تێڕوانین و بیرکردنەوە و تایبەتمەندیی جیاوازە. لەگەڵ تێڕوانین بۆ شتەکان، بیر لە نوێکاری و بەرەوپێشچوون دەکاتەوە. لەگەڵ هەنگاوی یەکەم، بیری لەلای چارەسەری هەر گرفتێکە کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

گەنجی داهێنەر ئەو گەنجەیە دەتوانێت بە توانا و ژیری و تێگەیشتنی خۆی داهێنان بکات، لە هەر بوارێك لە بوارەکاندا شتێکی نوێ بهێنێتە کایەوە، چاولێکەری نەبێت و لەوەوپێش نەبووبێت. یان چارەسەری بابەتێك دەکات کە بە

خەڵکی دیکە چارەسەر نەکراوە، ئەوەش جۆرێکە لە داهێنان. بۆ نموونە گەنجمان هەیە داهێنان لە بواری زانست، یان ڕۆشنبیری، ئابووری، کۆمەڵایەتی، وەرزشی، پزیشکی و ئەندازیاری و فیکر و فەلسەفە و کولتوور و... دەکات.

ئەو گەنجەی کە قووڵ بیر دەکاتەوە، زۆر نزیکترە لە داهێنان لەو گەنجەی کە ڕووکەشییە، چونکە گەنجی ڕووکەشی و سادە بیرکردنەوەی قووڵ نییە، زۆر نزیکە لە گاڵتەجاڕی و لە کاتبەڕێکردن، چونکە لەم ڕۆژگارەدا زۆرێک لە گەنجان لە کافتریاکاندا یان لە بازاڕدا یان لە جێگەیەکی گشتیدا بۆخۆیان دەسووڕێنەوە و کات دەکوژن، ئەگەر لێی بپرسیت ئەوە چی دەکەیت؟ دەڵێت خەریکی چی بم، دەمەوێت کات بکوژم. کەواتە ئەم گەنجە گرنگی بە داهێنان نادات، گرنگی بە توانا و چالاکیی خۆی نادات.

بەڵام ئەو گەنجەی کە خاوەنی داهێنانە، نەك هەر کات ناکوژێت، بەڵکوو بە هیچ شێوەیەك کاتی نییە ئەوەندە بەرنامە و پلان و نەخشەڕێگای هەیە.

بەداخەوە لە کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا بەگشتی، زۆربەی گەنجەکانمان گەنجی کاتبەفیڕۆدەرن، گەنجی گاڵتەجاڕین، ژیان بە گاڵتە بەڕێ دەکەن، بۆیە پێویستە جیاوازییەك لەنێوان گەنجی جددی و داهێنەر، لەگەڵ گەنجی گاڵتەجاڕدا بکەین.

## جیاوازیی نێوان گەنجی داهێنەر و گەنجی بێبەرنامە

### گەنجی داهێنەر

#### ١. گەنجی داهێنەر سەربەخۆیە لە بیرکردنەوەدا

سەربەخۆیی لە بیرکردنەوەدا دوو واتا دەبەخشێت: واتای یەکەم: لە سەرەتای قۆناغی گەنجیدا بەسەربەخۆیی بیر بکاتەوە، نیشانەی توانا و داهێنان و سەرکەوتووبوونیەتی، دووەم: کەواتە ئەم گەنجە پشت بە خۆی دەبەستێت و لەسەر پێی خۆی وەستاوە و گەنجێکی تەقلیدی و چاولێکەر نییە.

#### ٢. تێڕامان و بیرکردنەوە

هەموو داهێنانێك سەرەتا لە بیرکردنەوە و تێڕامانەوە سەرچاوە دەگرێت، دواتر بۆ جێبەجێکردن و داهێنان گەڵاڵە دەبێت. گەنج بیرتیژ و وردە، بەشێکی زۆر لە داهێنانەکانی ڕۆژئاوا لەسەر عەقڵ و توانای گەنجان وەستاوە.

#### ٣. کەڵکوەرگرتن لە جیهانی تازە

وەك پێشوو ئاماژەمان پێ کرد، جیهانگیری دنیای داهێنانە، گەنجی داهێنەر زوو لەگەڵ ئەم جیهانە نوێ و پێشکەوتووەدا هەنگاو دەنێت و لەگەڵیدا تێکەڵ دەبێت و سوودی لێ دەبینێت.

#### ٤. چاونەترسی لە بڕیاردان

داهێنان بەتایبەت لەم سەردەمی پێشکەوتنەدا، چاونەترسیی زۆری دەوێت. ئەو گەنجانەی داهێنەرن، چاونەترس و ئازان، لە چوونەپێش و هەنگاونان ناترسن، لە شکست و سەرنەکەوتنی تاقیکردنەوەکان ناترسن، لە پڕۆسەی دووبارەکردنەوە بەردەوامن و سەرنەکەوتنی یەکەم جاریان ساردیان ناکاتەوە.

**گەنجی بێبەرنامە**

گەنجی بێبەرنامە ڕێك پێچەوانەی ئەو خاڵانەیە کە پێشتر لە بارەی گەنجی داهێنەرەوە باسمان کردن:

**١. بێبەرنامەیە.**

گەنجێکی بێبەرنامەیە و هیچ پڕۆژەیەکی لە ژیاندا نییە، نازانێت چی دەکات و بەرەو کوێ هەنگاو دەنێت، بۆچی هاتووە و تواناکانی لە چیدا خەرج بکات.

**٢. بێئامانجە لە ژیان.**

ئەگەر گەنج لە ژیاندا ئامانجی دیاریکراوی هەبوو، دەتوانێت داهێنان بکات و خزمەتێك پێشکەش بە کۆمەڵگە بکات.

**٣. کاتبەفیڕۆدەرە.**

کات بەشێکە لە ژیانی داهێنەر، گەنجی بێبەرنامە هیچ گرنگی بە کات نادات، کاتەکانی لە گازینۆ و قاوەخانە و شوێنە گشتییەکان بەسەر دەبات.

**٤. دنیا لە دۆڵێکە، ئەو لە دۆڵێکی ترە.**

**٥. هەست بە بەرپرسیارێتی ناکات.**

**٦. خاوەنی هیچ نییە.**

**٧. گرنگی بە دارایی و بەهێزکردنی دارایی خۆی نادات.**

**٨. هەندێک جاریش خۆی سەرخۆش و بێهۆش دەکات.**

**٩. گۆشەگیر و تەنهایە.**

**١٠. خۆی ناناسێت.**

کەواتە گەنجی بێئامانج کاری بە دنیا نییە بەرەوپێش چووە یان بەرەوپێش نەچووە و پاش کەوتووە، مرۆڤەکان لە نیگەرانی و گرفتدان... هتد، یان نا، هیچ بیر ناکاتەوە، چونکە ئەوەی کە ئەو بیری لێ دەکاتەوە تەنیا بەڕێکردنی کاتە و ئەمڕۆ سپاردنیەتی بە سبەی و گرنگ ئەوەیە کاتی بڕوات. هەموو کاروبارەکان جێگەی گاڵتەپێکردنیەتی و گرنگی و بایەخ بە هیچ کاروبارێك نادات. ئەم ڕووداوانەی کە ڕوو دەدەن، یان ئینتەرنێت و ئامێرە تەکنەلۆژییەکان، ئایا ئەو لەگەڵ ئەو شەپۆلەدا لە چ ئاست و قۆناغێکدایە، بە هیچ شێوەیەك بیری لێ ناکاتەوە.

ئەو جۆرە کەسە بێبەرنامە و بێئامانجە، هیچ گرنگییەك بە بەرپرسیاریەتی نادات؛ بەرپرسیاریەتیی خۆی، بەرپرسیاریەتیی خێزان، بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵگە، بەرپرسیاریەتیی نیشتمان. بەڵام ئەو گەنجەی کە داهێنان دەکات، هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات و خاوەنی ژیری و توانایە، جەستە و مێشکی بەهێزە و لەو دەرئەنجامەوە هەست بەوە دەکات بەرپرسیاریەتیی لەسەر شانە و دەبێت ئەو بەرپرسیاریەتییە ئەدا بکات.

## بەربەست و ڕێگریی بەردەم گەنج و داهێنان

ئەمڕۆ گەنج لە جیهانی ئیسلامیدا کەوتوونەتە بەر کۆمەڵێك گرفت و کێشە و بەربەست کە ڕێگرن لەبەردەم هەنگاو و داهێنانەکانی گەنجان. ئەو ڕێگر و بەربەستانەی دێنە پێش، پەردەیەك لەنێوان ئێمە و گەنجدا دروست دەکەن، ئەو پەردەیەش وا دەکات گەنج نەتوانێت هەنگاو بنێت و دژ بە گەنج دەوەستێتەوە.

هەڵبەت بۆ لادانی کۆسپ و تەگەرەی ڕێگا، دەبێت سەرەتا بزانیت ئەو کۆسپانەی کە دێنە پێشیان چین، لە کوێوە هاتوون و بنەماکەیان چییە، ئینجا دەبێت بزانرێت کۆسپەکان چەند جۆرن و ڕێگریی داهێنانیان لێ بکات، بەتایبەتی لە وڵاتی خۆماندا.

### کۆسپی یەکەم: نەبوونی سیستمی ڕێکخستنی ژیان

هەڵبەت سیستمی ڕێکخستنی ژیان زۆر لێڵ و بێبەرنامەیە، سیستمێکی ڕێکخراو و ڕێکوپێك و داڕێژراو نییە، تەواوی سێکتەر و دامەزراوەکان و تەنانەت تەواوی تاکەکانیش دەبینین کەوتووینەتە ناو شەپۆلێکی بێڕێکخستنەوە. کات و کار و تەمەنمان ڕۆژانە بەبێ ڕێکخستن سیستماتیك تێدەپەڕێت و دەڕوات. دەکرێت بڵێین تەواوی ژیانی کۆمەڵگەکەمان بێستراتیژ و بێتاکتیك و بێنەخشەڕێگا و بێڕێکخستنە، ئەوە گەورەترین لەمپەری بەردەم گەنجە. بۆ نموونە هیچ پلانێك نییە بۆ ڕێکخستنی ئەم ٢٤ کاتژمێرە، بۆیە بەشێکی بێبەرنامە لە خەودایە و بەشێکی تری هیچ پلانێکی بۆ بەرهەمهێنانی ئەم کاتانە نییە، زۆربەی کاتەکانی لە سەرەی بەنزین و فەرمانگە و کارە ڕۆتینییەکان دەڕوات.

گەنج دەبێت کات و ڕۆژ و ساتەکانی خۆی ڕێك بخات، بۆ نموونە گەنجێك بیەوێت داهێنان بکات و هەنگاوی پلانبۆداڕێژراو بەرەو ئامانجێکی دەستنیشانکراو بنێت، دەبێت کاتەکانی بکاتە سێ بەش، بەشێکی بۆ خەو و پشوودان، واتە هەشت کاتژمێر، بەشێکی بۆ ژیان و گوزەران و خواردن و خواردنەوە و کار، بەشێکیشی بۆ داهێنان و نوێکاری و ماف و پشك و بەرپرسیاریەتی و دینداری. سێ هەشت دابەش بکاتە سەر سێ کاتی دابەشکراو، هەموو پێکەوە دەکەنە بیست و چوار کاتژمێر. ئەو گەنجەی کە نایەوێت داهێنان بکات، ڕێکخستن لە ژیانیدا نییە. لێرەدا کە دەڵێین گەنجی داهێنەر، بەربەست و لەمپەری لەپێشە، لەبەر ئەوەی سیستمی ژینگەی ئێمە ژینگەیەکی ڕێکخراو نییە تا کەسەکە بەئاسانی بکەوێتە سەر سکەی خۆی و ئەوە بکات.

### کۆسپی دووەم: نەبوونی دارایی و ئابوورییەکی باش لەبەر دەستی گەنج

سروشتی ئەو وڵاتانەی کە داهێنان دەکەن و گەنجەکانیان کەوتوونەتە سەر ڕاستەڕێ و توانای داهێنانیان هەیە، توانای دارایی و پارە و ئابوورییان زۆر بەهێزە.

هاوشێوەی ئەو وڵاتانەی کە دەڵێین دۆخ و ژینگەیان لەبارە داهێنەر بن، هەموو

شتێکیان بۆ فەراهەم کراوە، بۆ نموونە گەنجێك كاتێك دەیەوێت داهێنان لە بواری فرۆکەوانیدا، لە بواری ئامێری پزیشکی، لە بواری ئامێری تەکنەلۆژیدا بکات، هەموو شتێکی بۆ فەراهەم دەکرێت. بەڵام لە وڵاتی ئێمە بێسەروبەرییە و ئەوە نییە، واتە لەلای ئێمە گەورەترین گرفتی داهێنەرەکان ئەوەیە کە شوێنێك نییە پشتیوانیی دارایی بگرێتە خۆی و بڵێین دارایی ئەو کەسە فەراهەم بکەن. لەبەر ئەم هۆکارە هەر چەندە هێزی داهێنان و تێڕوانینی داهێنەرانە هەبێت و لە بیرۆکەیدا بێت، بەڵام ئەگەر گرفتی دارایی هەبێت ناتوانێت هەنگاو بنێت.

### کۆسپی سێیەم: لەمپەری کۆمەڵایەتی

یەکێکی دیکە لە بەربەست و ڕێگرەکان بریتییە لە ڕێگر و لەمپەری کۆمەڵایەتی، بۆ نموونە: نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، هەڵسوکەوتی بنەماڵە، دەسەڵاتی هۆز. دەروانیت دەوروبەرێکی شکستخواردوو، بنەماڵەیەکی بێپەروا، تازەکی بۆ سەردەمی نەریت و هەڵسوکەوتی کۆن، بۆ سەردەمی چاولێکەری و جۆرێك لە نەزانی و نەخوێندەواری دەگەڕێنەوە، واتە کۆمەڵێك کاریگەریی جۆراوجۆر. یان جاری وا هەیە باوك یان دایك ڕێی پێ نادەن، لەبەر ئەوەی لەو شتانە ناگەن و نازانن داهێنان و چوونە پێش چییە.

ئەو جۆرە بیرکردنەوانە زۆر ماندووت دەکەن و قەبووڵی نوێکارییەکان ناکەن و بە هەر جۆرێك لە جۆرەکان ڕێگریی بۆ دەدۆزنەوە. کە وا بوو ڕێگریی کۆمەڵایەتی ڕێگرییەکی زۆر گەورەیە و ڕێ لە تاك دەگرێت و ناهێڵێت گەنجی داهێنەر بوونی خۆی لەم دنیای جیهانگیرییەدا بسەلمێنێت و داهێنان بکات.

زۆر گەنجم دیوە و گوتوویانە دایك و باوکمان ڕێگرە، ئەوەش زۆر ڕۆڵی لە دروستبوون و پێگەیاندنی تاکەکەن هەیە، دەڵێت دایکم ناهێڵێت خۆم پەرە پێ بدەم و لەسەر دەرکەوتنم ڕازی نییە. گەنج بەم شێوازە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەیت؛ وزە و هێز و ئارەزوو و خولیاکەی دەڕوات، واتە ئەو گەنجە کوژرا، ئەمە لەبەر ڕێگر و لەمپەری کۆمەڵایەتی.

**کۆسپی چوارەم: نەخوێندەواریی دێهاتیی پەڕگیر**

تا ئێستا گوندنشینی لە هەندێک حاڵەتدا هێشتا لە قۆناغی نەخویندەواریدا ماون، یان گۆشەگیرن، بەڵام لەم دێیانە گەنجی هەڵکەوتوو و داهێنەر هەیە، توانای زۆر زۆرە، دایك و باوکی ڕێگەی پێ نادەن هەنگاو بنێت و داهێنان بکات. جاری وا هەیە گەنج دەڵێت من لە شوێنێك دەژیم گوندە، گوندێکی گچکەیە و زۆرینەی نەخوێندەوارە، دەوربەرەکەم هەموو ئاژەڵدارن، بەو جۆرە کارەوە سەرقاڵن و تەنیا ئەویان بەلاوە پەسەندە و ڕێگە بە من نادەن کە بێمە ناو دنیای پێشکەوتن و دنیای پەرەپێدان و نوێگەرییەوە تا بتوانم هەنگاوەکانی خۆم ببینم. ئەو ڕێگرییە توانای گەنجەکە دەکوژێت.

**کۆسپی پێنجەم: نەبوونی هیچ هاریکاری و هاوکارییەکی حکومەت بۆ گەنجان**

ئەم لەمپەرە لە هەموو لەمپەرەکانی تر کاریگەرتر و ترسناکترە، حکومەت لە وڵاتان پاڵپشتە بۆ گەنج و داهێنان، بە پڕۆژە و قەرزی بچووك هاوکاریی دارایی و فیکری یارمەتیی گەنج دەدات تا بتوانێت ئەم توانایەی خۆی بەکار بهێنێت. بەداخەوە لە وڵاتی ئێمە گەنج بەدەست ئەو گرفتانەی حکومەتەوە بۆیانی دروست دەکات سەرگەردانە، بۆیە گەنج لەجیاتیی داهێنان، بەرەو ڕۆژئاوا سەری خۆی هەڵدەگرێت و لەوێوە لە زەریاکان دەخنکێت و دەبێتە خۆراکی گیاندارانی ناو دەریا.

کۆمەڵێك بەربەست و لەمپەرمان باس کرد ڕێگرن لە بەردەمتدا و ناهێڵن داهێنان بکەیت، بەڵام بێگومان هەموو گرفتێك چارەسەری هەیە، هەموو بەربەست و لەمپەرێک دەتوانرێت لا بدرێت، بۆیە نابێت کۆڵ بدەیت و لە هەنگاوەکانت سارد ببیتەوە، نەکەیت ڕۆژێك لە ڕۆژان بڵێی ئەم لەمپەرانە چاریان نییە و دەبێت خۆ بەدەستەوە بدەم.

کاتێك بڕیار دەدەیت دەبێت چیمان پێ بکرێت، دەبێت بۆ بەرانبەرگرتن لەگەڵ ئەو لەمپەر و ڕێگرانەدا ڕووبەڕوو ببینەوە و بەڕاستی پاڵپشت بین، پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی.

ئێمە ئەگەر هەر بەڕاستی و بەجددی دەمانەوێت کۆمەڵێك گەنجمان هەبن

داهێنەر بن و بەرەو نوێگەری بچن، دەبێت لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە پشتیان بگرین.

ئێمە تا ئێستا یەك لە گرفتەكانمان ئەوەیە هەتا گەنجە گرنگیی پێ نادەین و دەڵێین ئەوە گەنجە و خوێنی گەرمە، ئینجا كە تێپەڕی، ئیتر ئەویش ڕۆحی داهێنانی دەمرێت. بۆیە پێویستە هەر چی زووترە، پشتگیریی ماددی و مەعنەویی گەنج بۆ چوونەپێش و تێپەڕاندنی ڕێگرەكان بكەین.

دووەم: پێویست و گرنگە ئێمە هەوڵی ڕاهێنان و ئامادەسازی بدەین و زۆر خول و چۆنیەتیی سازدانی سەردەمیانە بۆ ڕاهێنانی پیشەیی و ئەكادیمی بگرینە بەر.

ئەوەی كە پیشەییە، وەك ئەوەی گەنجێكمان هەیە لە كاری پیشەی بازرگانییەوە بەهێزە، یەكێكی دیكە لە بواری كشتوكاڵی بەهێزە، ئەوی دی لە چوارچێوەی خولیا و دەستی لە پیشەزانیدا بەهێزە، ئێمە با بێین هەموو ئەوانە بخەینە ناو ڕاهێنانی كرداری، بە پراكتیك ئەو گەنجە بتوانێت بە ئاستی ئەوەی لە باریدایە، با داهێنان بكات.

بوارە ئەكادیمییەكە ئەوەیە ئێمە هەندێك گەنجمان پێویستە بیانخەینە بواری ئەكادیمی، بۆ ئەوەی ڕاهێنان و مەشقی ئەكادیمی بكەن، چونكە مرۆڤ بە ڕاهێنان زۆر شت فێر دەبێت، زۆر گرێكوێرە و بەربەست دەبڕێت.

سێیەم: پاڵپشتی و هاندان

هەروەها یەكێكی دیكە لەو ئەو خاڵانەی كە هیچ خەرجیی نییە، بریتییە لەوەی پاڵپشتییان بكەین و هانیان بدەین، چونكە زۆر جار كە بەخۆمان ناتوانین داهێنان بكەین و پێمان نەكراوە، كەچی پاڵپشتیی ئەو گەنجەش ناكەین و دەبینە بەردێك لەسەر ڕێگەی داهێنانی ئەو و بەردەوام دەیشكێنین و نەك هەر پشتی ناگرین، بەڵكوو ڕێگرییشی لێ دەكەین.

چوارەم: بەرزكردنەوەی ئاستی گەنج

خاڵێكی دیكە كە زۆر گرنگە، ئێمە لە ڕووی زانستییەوە؛ زانستە مرۆییەكان و

زانستە ئەدەبییەکان، تاکی گەنج زۆر بەرز بکەینەوە، ئەویش بەوە دەبێ کە ئەمڕۆ دنیای جیهانگیری زۆر شتی فەراهەم کردووە، واتە ئەگەر دۆخ لەبار بێت، دەتوانیت گەنج بۆ ئەمەریکا و ئەورووپا و هەر وڵاتێکی دیکەی پێشکەوتووی دنیا بنێریت، بۆ ئەوەی لەوێ فێر بکرێت و ڕابهێنرێت و دروست ببێت.

زۆر کەس هەن پارە و سامانێکی زۆر لە بواری خێرخوازیدا بە دەستی خەڵکی نەدارەوە دەدات، ئەگەر بێت و گەنجێك پاڵپشت بکەن و بینێرنە بەر خوێندن، پاشان ئەوان تاروساز دەبن و میللەت بەتەواوی لە هەژاری ڕزگار دەکەن.

ئێمە ئێستا بووین بە وڵاتێکی بەکاربەر، دەتوانرێت ئێستاش پێداچوونەوە بکرێت، بۆ ئەوەی گەنجەکانمان بەڕاستی بێنەوە پێشەوە و سنگ بنێن بە ئەگەری هەموو مەترسییەکەوە.

لە جۆرێك دۆخی وەك پێشەوەدا، ئەگەر ئەو کەسە داهێنانیشی هەبووبێت، کاتێك لە دەوڵەمەندێك دەڕوانێت، لە حکومەت و کۆمەڵگەکەی و ژینگەکەی ورد دەبێتەوە، دەبینێت هەموویان ڕێگر و لەمپەرن.

## چیمان لە گەنج دەوێت؟

هەوڵی ئێمە بەرچاوڕوونی و خۆناسین و ئاڕاستەیەکی ڕۆشنبیرییە بۆ گەنجان، بەڵکوو گەنج لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە وزە و تواناکانی خۆی ببینێتەوە، لە ڕۆژگار و دەرفەتێکدا بتوانێت داهێنان بکات و جیهانگیری لە خزمەتی جیهانی موسوڵماناندا بەکار بهێنێت. ئەم وڵاتە بەهێزانەی وەك چین و ژاپۆن و ئەمەریکا، لە قۆناغێکدا زۆر لەدوای ئێمەوە بوون، بە خۆدۆزینەوە توانییان دەرفەت بۆ خۆیان بڕەخسێنن، ئێستا بوونەتە پێشەنگی داهێنان و ئابووری و پیشەسازی و تەکنەلۆژیای سەردەم، ئێستا دەرفەتیان بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا و گەنج بەتایبەتی ڕەخساندووە، تا بتوانن لە تەواوی سێکتەرەکانی ژیاندا بەشدار بن، ژینگەیەکیان دروست کردووە کە بۆ گەنج گونجاوە، دەوڵەتێکیان دروست کردووە کە بۆ گەنج گونجاوە. ئەمە بۆ خولقاندنی کەشی لەبارە بۆ ئەوەی گەنج بتوانێت کار بکات، بۆ ئەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە بچێتە پێش و هیچ ڕێگرییەك نەبێت و هەموو بەربەستەکان تێبپەڕێنن. بۆیە ئێمە پێوستمان بەوەیە چاودێریی گەنج بکەین و وزە و توانایان بدۆزینەوە، بزانین لە کام بواردا خولیایان هەیە.

**یەکەم: ناسینی توانا و وزەیان**

هەموو گەنجێك جۆرێك لە بەهرە و توانای تێدایە، پێویستە سەرناس و دەستگرێك بیاندۆزێتەوە، ئەمەش پێویستی بە چەند هەنگاوێك هەیە. لەوانە:

ئـ. کردنەوەی خول و پێشبڕکێ. یەکێك لە ڕێگا گرنگەکانی دۆزینەوەی توانای گەنج خول و پێشبڕکێیە، لەم خولەدا زۆر گەنج دەردەکەون کە چ وزە و توانایەکی بەهێزیان هەیە.

ب. لیژنەی شارەزا. پێویستمان بە لیژنەیەکی هەمەپسپۆڕی لە بواری کۆمەڵناسی و پەروەردەیی و سایکۆلۆژی هەیە، تا بتوانن توانای گەنجەکە هەڵبسەنگێنن.

پ. ڕاهێنان. ڕاهێنانی گەنج لەسەر هەندێک بوار کە داهێنانی تێدا دەکرێت، لەوێوە بزانین چەندە لەم ڕاهێنانەدا سەرکەوتووە.

ت. گەشەپێدانی کەسی. گرنگیدان و گەشەپێدانی کەسی لە بوارە جیاجیاکاندا، بە شێوازی تاقیکردنەوەی تیۆری و کارەکی. هەوڵی گەشەی کەسییان پێ بدرێت لە بەتواناکردنی جەستەیی و دەروونی و تەندروستی و تەواوی بوونی.

ج. ڕەخساندنی کەشی ئازاد و دەرفەت بۆ ئەو کەسانە بدۆزینەوە کە لە بواری ڕۆژنامەگەریدا گەنجن و دەتوانن کار بکەن، بۆ نموونە ئازادییەکیان بۆ بڕەخسێنیت بۆ ئەوەی بتوانن داهێنان بکەن و گوزارشت لەو ناوازەیی و نوێکارییەی خۆیان بکەن. ئەمانە هەموویان دەرفەتن، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەست بەوە بکات کە بەڕاستی گرنگیی پێ دەدرێت و کە کەسانێك هەن ڕۆڵیان پێ داوە و ڕاگەیاندنیان بۆ خستووەتە بەردەست.

ئەمانە کۆمەڵێك بابەتن و بەڕاستی پێویستن وەبیریان بهێنینەوە و وەدەستیان بهێنین، هەروەها بتوانین گەنجان لەو فەزا ترسناکە بۆ ژینگەیەکی گونجاوتر دەربهێنین کە خۆی تێدا ببینێتەوە، داهێنانی تێدا بکات و گرنگی بە خۆی بدات، هەروەها هەموو ئەو وزە و توانا و چالاکی و فام و زیرەکییەی کە هەیەتی، بێت و لە جێبەجێکردنی کرداریدا بەرجەستەی بکات.

پاشان ئەوەی کە جێی باسە قسەی لەسەر بکەین، ئەوەیە کە پاشان ئێمە گەنجەکان گەورە دەکەین و دەیکەینە داهێنەر، چیمان لێیان دەوێت و چی بکەن؟ خستنەگەڕی تواناکانیان بە کرداری بچەسپێنن، لە شوێنێکدا فەراهەم بکرێن و بیانخەینە ژێر بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵگاوە. کۆمەڵگەی ئێمە زۆر پاشەکشەی کردووە، زۆر بۆ دواوە ڕۆیشتووین و ئەو گەنجانەی هەمانن بەزۆری تووشی شکست بوون و ڕووبەڕووی بابەتە بێهۆشکەرەکان بوونەتەوە، چونکە گەنجی داهێنەر ناچێت بە جگەرە و شەراب و حەشیش و شتی خراپ عەقڵی خۆی لەدەست بدات، بێگومان داهێنەرەکە هەمیشە لە بیری داهێنان و بەرەوپێشچووندایە.

دووەم: پێویستە هەنگاوی پلانی شیاو و پێویست دابڕێژین، تا وەك وڵاتە بەتواناکانمان لێ بێت. وڵاتانێکی هاوشێوەی وڵاتانی پێشکەوتووی خۆرئاوا لەبەرچاو بگرین و وەك ئەوان خزمەت پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکەین.

سێیەم: لادانی بەربەست. بتوانین بەربەستەکان لا ببەین و بە هاوکاریی ئەو گەنج و لاوانەی هەمانن گۆڕانکاری بکەین، گۆڕانکاری لە سیاسەت و فیکر و تەکنەلۆژیا و لە ڕاگەیاندنماندا بکەین، تەنانەت گۆڕانکاری لە خوێندن و زانکۆکان و لە بواری زانست و بوارەکانی تر. ئەمانە هەموو زۆر گرنگن بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین لەو بوارانەدا دەرفەتی گەورە بە گەنج بدەین بۆ ئەوەی وەبەر بهێنرێن و کەڵك بدەنەوە.

هەر گەنجێکی داهێنەر توانای ڕزگارکردنی خێزانێکی هەیە، توانای ڕزگارکردنی کۆمەڵگایەکی هەیە و توانای ڕزگارکردنی وڵاتێکی هەیە.

زۆر جار گەنجێك یەك داهێنانی کردووە، بۆ نموونە ئەو کەسەی کە فەیسبوکی داهێناوە، ڕۆژانە چەند ترلیۆن دۆلار دەباتە بازنە و چوارچێوە و بودجەی ئەمەریکاوە، واتە داهاتێکی گەورە بە هۆکاری توانا و کارامەیی یەك کەسەوە. ئەو کەسەی کە گوگڵی داهێناوە، گەنجێك بووە و بە هۆکاری ئەو کارەوە سەرمایەی ئەو وڵاتە تەواو بەرز بووەتەوە. ئەپڵ، هەروەها مایکرۆسۆفت، دیسان گەنج تێیاندا داهێنەر بوون و پەرەیان پێ داوە و گەیشتوونەتە ئەو ئاستە گەورەیە، کە ئەگەر بێت و تەنیا یەك گەنج لەم کوردستانەی خۆماندا یەك داهێنانی ئاوای بکردایە، هەموو وڵاتەکەی لە قەیران و گرفتی ئابووری و دارایی ڕزگار دەکرد.

پێویستە هەموو لایەکمان دەرفەت بۆ گەنج بڕەخسێنین و وا بکەین گەنج گەنجێکی داهێنەر بێت، گەنجێکی سەرکەوتوو بێت و شکستخواردوو نەبێت، گەنجێك بێت بتوانێت لەم دنیای جیهانگیرییەدا بەرهەمی زۆر باش پێشکەش بە کۆمەڵگا و ژیان بکات، نەك گەنجێکی بەکاربەر و بخۆری بێجووڵە و بێپلان بێت.

## تەوەری حەوتەم: گرنگیی داهێنان

ئەو بابەتەی کە ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ لە هەموو جێگە و شار و کۆمەڵگە و وڵاتێکدا شانازیی پێوە بکرێت، بریتییە لە داهێنان.

پێشتر باسی گەنجی داهێنەرمان کرد، ئێستا باسی خودی داهێنان دەکەین، واتە گرنگیی داهێنان لە ژیانماندا، بۆ ئەوەی گەنج هەستوسۆزی بۆی هەبێت و هەنگاوی بۆ بنێت و بۆ گەیشتن پێی ڕەنج بدات و جێپەنجەی دیاری بکات.

ئەی گەنج، ئەو داهێنانەی کە ئەمڕۆ بە هۆی تەکنەلۆژیای سەردەمەوە هاتووەتە بەرهەم و بەردەست، ئەوە بەرهەمی کەسێکی وەك تۆی گەنجە، بەڵام ئەو گرنگیی پێی داوە و تۆ گرنگیت پێ نەداوە، ئەو دەرفەتی بۆ ڕەخساوە و تۆ دەرفەتت بۆ نەڕەخساوە، ئەو هەوڵی بۆ داوە و تۆ خۆتت تێنەگەیاندووە.

دنیا هەنووکە دارای خێراییە، ئاسانکاری لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا بە هۆی داهێنانەوەیە، مۆبایل و فڕۆکە و کامێرا و ئەوەی کە پێی دەڵێن گەیاندن و ئاسانکاری، هەمووی بەشێکە لە داهێنان. ماڵ و کەلوپەل و زۆربەی شتەکان بوونەتە کۆنترۆڵ و دەجووڵێن، ئەوە هەمووی داهێنانە. ئەو داهێنانانە گەنج کردوویەتی، بەڵام بەداخەوە گەنجی ئێمە لەو ڕەوتی داهێنانەدا بەشدار نییە، چونکە لەبەر کێشەی خۆی، نەیتوانیوە بیر لەوە بکاتەوە کە گەنج لە پێشەنگدایە بۆ داهێنان، بیری لەوە نەکردووەتەوە چ هەنگاوێك بنێت بۆ ئەوەی داهێنان بکات.

پاشان باس لە گرنگیی داهێنان و ڕێگرییەکانی و جۆرەکانی و قۆناغەکانی دەکەین، بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین بەلای کەمەوە دەرگایەك لە خۆمان بکەینەوە و بڵێین کە ئەی گەنج، تۆ توانات هەیە بەو قۆناغانەدا بڕۆیت و تەبەنییان بکەیت و ئەو گرفتانە چارەسەر بکەیت، تواناشت هەیە جێپەنجەی خۆت لە داهێناندا دیاری بکەیت.

## گرنگیی داهێنان لە ژیانی گەنج

ئەی گەنج، ئاوڕێك لە خۆت و دەوروبەرت بدەوە، ئاوڕێك لە كۆمپیوتەرەكەی بەردەستت بدەوە، ئاوڕێك لە مۆبایلەكەی ناو دەستت بدەوە، ئاوڕێك لە بابەتی ئەمڕۆی سەفەر و گواستنەوە بدەوە، ئاوڕێك لەم هەموو تەكنەلۆژیای سەردەمە بدەوە، ئاوڕێك لەو هەموو بۆمبی ئەتۆمیی وزەی گەردیلەیی و ئەو هەموو مانگە دەستكردە بدەوە، ئاوڕێك لە ئەم هەموو پێشكەوتن و داهێنانە بدەوە، بۆت دەردەكەوێت كە داهێنان چەندە گرنگە.

گرنگیی داهێنان لەوەدایە:

١. زیادبوونی گەشەی ئابووری: گەشەی ئابووری لە داهێناندایە. لە وڵاتانی ئەورووپیدا بە هۆی داهێنانەوە هەلی كار یەكجار زۆرە، بەڵام ئێمە داهێنانمان نییە، بۆیە دەبینیت هەلی كار نییە.

بۆ نموونە؛ وڵاتی ئێمە گیرۆدەی ئەوەیە تەنیا نەوت دەردەهێنێت و كشتوكاڵ و بازرگانی و پیشەسازیی فەرامۆش كردووە، تا دەگاتە لایەنەكانی دیكە. تەماشا دەكەیت بەرهەم لە وڵاتدا نییە و هۆكاریش ئەوەیە كە داهێنان نییە.

٢. كەمیی تێچووی بەرهەمهێنان: خاڵێكی دیكە كە بریتییە لە تێچووەكانی بەرهەمهێنان، زۆر كەمی دەكاتەوە، واتە ئەو بەرهەمانە لە زەمەنی داهێناندا تێچوویان زۆر كەمە.

٣. جوان ئەداكردنی كارەكان: ئەمڕۆ لەبەر پێشكەوتنی تەكنەلۆژیا و داهێنانی زۆر، مرۆڤ بە ئەدای جوان نەبێت ڕازی نابێت. ئەو كارانەی دەیكەیت، ئەگەر بە داهێنانەوە بیكەیت؛ ئەدایەكی جوان پێشكەش دەكەیت. ئەگەر تەكنەلۆژیا بێت، تا دەگاتە كشتوكاڵ و بوارەكانی پیشەسازی و تەواوی بەشەكانی دیكەی ژیان، هەموویان بە ئەدایەكی جوان و تێچوویەكی كەم پێشكەش دەكەیت.

٤. متمانەبەخۆکردن: متمانەبەخۆبوون سەرەتای هەموو داهێنانێکە. ئەگەر تۆ داهێنان بکەیت، کەواتە متمانەت بە خۆتە و لێوەشاوەیت و کەسێکی داهێنەریت.

٥. دەروون ئارامی: دنیای گەنج پڕ بووە لە نائارامی و سترێس، هۆکارەکەشی بێکاری و دەرنەبڕینی تواناکانیانە. ئەگەر داهێنان بکەیت، ڕەزامەندییەکی زۆر قووڵ بۆ ناخ و دەروونت دروست دەبێت، دەروونت ئارام و ئۆقرەگرتوو دەبێت. ئەوەش لەبیر نەکەیت، لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە ئامانجەکانی خۆت دەپێکیت.

## داهێنان چییە؟

ئەگەر بێین و سەرنج لەو زاراوەیە بدەین، دەبینین داهێنان (إبداع) وشەیەکی زۆر گرنگە و پەیوەندیی بە زۆر لایەنەوە هەیە. لە وشەی داهێنان ورد ببەوە، یان کە دەگوترێت ئەو کەسە خاوەنی داهێنانە، هەموو ئەوانە پێمان دەڵێن بەڵێ، داهێنان و نوێکاری بەو کەسە دەڵێن کە دروستکارە.

بۆ نموونە؛ کەسێك لە کشتوکاڵدا یان لە گەشەپێدانی مرۆییدا کار دەکات، کەسێك لە بواری بابەتی بیناسازی و بازرگانی و هەر جۆرە پیشەسازییەکدا کار دەکات، هەر کەس لە ئاستی خۆی جۆرێك لە داهێنان دەکات. کەواتە پێناسەی داهێنان؛ دروستکردن و بەرهەمهێنانی شتێکە کە پێشتر نەبووە، تازەیە و داهێنانە.

بۆ نموونە؛ کامێرایەك ئەمڕۆ کە ڕەنگاوڕەنگە و زۆر لەپێشە، ئەوە جۆرێکە لە داهێنان، چونکە پێشتر ئەو جۆرەی نەبووە. ئێستا لە وڵاتان شێوازی تونێل پەیدا بووە، بە نوێکاری و تایبەتمەندیی جیاواز کە جۆرێکە لە داهێنان. هەروەها هەنووکە خوێندن لە زۆر قوتابخانەدا بووەتە ئۆنلاین و لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاوە دەخوێنن، ئەوە داهێنانە. گەنجان هەر لە جێگەی خۆیانەوە بوون بە خاوەنی ڕاگەیاندنی تایبەت بە هۆی بەکارهێنانی ئەو ئەکاونت و پەیجانەی هەیانە. ئەوە هەمووی بەرهەمی داهێنانە، هەمووی گەیشتنە بە شتێك کە پێشوو نەبوون.

کەواتە ئەی گەنج، بیر لەوە بکەرەوە کە هەر هەنگاوێك دەنێیت؛ بیخوێنەوە و

بزانە هەر یەکێك لەو هەنگاوانە دەبێت بەرەو داهێنان بێت و پاشەکشەی تێدا نەبێت، بەڵکوو بەردەوام بە لە چوونەپێش و هەنگاوی نوێ. بۆیە دەبینیت کارلێککردن و ئاوێتەبوونی داهێنان، لەگەڵ هەموو بەشەکانی ژیاندایە. بۆ نموونە کارلێك لەگەڵ ژیریدا دەکات، کارلێك لەگەڵ ژینگەدا دەکات، کارلێك لەگەڵ بواری کۆمەڵایەتی و بواری کەسیدا دەکات، واتە بە جۆرێك لە جۆرەکان کەسی داهێنەر سەرەتا کارلێك لەگەڵ خۆیدا دەکات و لەگەڵ خۆیدا ئاوێتە دەبێت، لەگەڵ ژینگەدا ئاوێتە دەبێت، لەگەڵ بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا ئاوێتە دەبێت، لەگەڵ بوارە عەقڵییەکاندا ئاوێتە دەبێت، لەگەڵ بوارە فیکرییەکاندا ئاوێتە دەبێت، لەگەڵ بوارە مەعنەوییەکاندا ئاوێتە دەبێت، بەگشتی ژیان لە ڕووی زانستی و فیکری و لە ڕووی بەشەکانی ترەوە لەگەڵ کەسی داهێنەردا هاوبەشی دەکات و تێکەڵ دەبێت.

## قۆناغە پێویستەکانی داهێنان

داهێنان و بابەتی تازەبەرهەم کۆمەڵێك قۆناغی پێویستە. ئەی گەنج، کاتێك دەتەوێت داهێنان بکەیت، لە نووسینەوە تا دەگاتە مەسەلەیەکی گرنگی ئەمڕۆ، دەبێت ئامادەکاری بۆ چەند قۆناغ و هەنگاو بکەیت، بۆ ئەوەی بتوانیت داهێنان بکەیت. بۆ نموونە کەسێکمان هەیە لە کۆلێژ دەرچووە، بەشی ژمێریاری، یان بەشی دەرمانسازی، یان بەشی پزیشکی، یان بەشی ئایینیی تەواو کردووە، کاتێك کە دەیەوێت داهێنان بکات و نوێکاری بکات، دەبێت چەند قۆناغێك ببڕێت.

قۆناغی یەکەم: دەبێت دەروونی خۆی بۆ داهێنان ساز و ئامادە بکات. ئەمە کەموکووڕییەکی زۆر گەورەیە لە ئەمڕۆدا، گەنجەکانمان نەك ئامادەی داهێنان نین، بەڵکوو بەشی زۆریان تووشی گرفتی گەورە بوون، بۆ نموونە زۆربەی گەنجەکان دێن و دەڵێن مامۆستا ئێمە گرفتمان هەیە، چییە گرفتەکەت؟ دەڵێن شەوان خەومان لێناکەوێت و قورگمان دادەگیرێت و... لەو بابەتە.

لە کاتێکدا لە وڵاتان گەنج سەرقاڵی داهێنان و ئامادەکارییە، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا گەنج خەریکی ئەوەیە لەم هەموو گرفتە کەسی و گشتییە ڕزگار ببێت، لە کاتێکدا دەرچووە و توێژەری کۆمەڵایەتییە، یان لە کۆلێژێکی بەرز و بە

ئاستێکی بەرزەوە خوێندنی تەواو کردووە، بەڵام لەولاوە ژینگەیەکی نالەبار و دۆخێکی بێئۆقرەیی ڕووبەڕووی بووەتەوە و بەو ئاقارەی گەیاندووە.

جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین مامۆستایانی ئایینی بەشێکیان لە کاتی بوونی ئەو جۆرە دۆخە ناسەقامگیرییەی گەنجاندا، بۆ جنۆکە و جادوو و فاڵ و ئەو جۆرە بابەتانەی دەگەڕێننەوە. گرفتە دەروونییەکە هەر چییەك بێت، دەڵێن ئەوە جنۆکەیە. هەبووە گوتوویەتی مامۆستا ئامێرێکی لە قوڕگم داوە و گوتوویەتی ئەو ئامێرە بۆ چارەسەری جنۆکەیە، ئەوە کارەساتە کە تۆ بە ئامێر جنۆکە ببینیتەوە! سووکایەتیکردنە بە ئایین و بە ژیری و ویژدان.

قۆناغی دووەم: قۆناغێکە پێی دەڵێن خەملاندنی بابەتەکە لە مێشکدا. بۆ نموونە تۆ بتەوێت لە بارەی بابەتێکەوە، با بڵێین سیاسی، داهێنان بکەیت، ئەم بابەتە لە مێشکی خۆتدا گرد بکەیتەوە و تەواو بیخەملێنیت، تاوەکوو لە مێشکتدا گەڵاڵە دەبێت و هەموو ڕەهەندەکانی ئەو بابەتە لەناو بیر و مێشکتدا دابنێیت. کەسێك دەیەوێت لە بارەی یەکێك لە بەرنامەکانی کۆمپیوتەرەوە داهێنان بکات، بۆ نموونە مایکرۆسۆفت یان لە فۆتۆشۆپ، ئەم کەسە دەبێت سەرەتا لە مێشك و بیری خۆیدا ئەو بابەتە بخەملێنێت، هەموو ڕەهەندەکانی کۆ بکاتەوە و پێشتر زانیاریی کۆ کردبووەوە، هەڵبەت ئەوانەی لە بیری خۆیدا کۆ کردووەتەوە بۆ ئەوەی هەڵیانبسەنگێنێت، شییان بکاتەوە، تاوتوویان بکات.

گرفتی ئێمە لەم ڕۆژگارەدا بریتییە لەوەی زۆر کەم پشت بە سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە دەبەستین، هەموو شتەکانمان بەگشتی ڕووکەشییە، زانیارییەکانمان کرچوکاڵە، بۆیە دەبینیت گەنجی موسوڵمان زۆر لەپاشترن لەچاو ئاست و لەپێشیی خەڵکانی تر، چونکە خەڵکی تر هەوڵی داوە بابەتەکە بخەملێنێت و زانیاریی لەسەر وەربگرێت و کۆی بکاتەوە. تۆ بزانە جاری وا هەیە کەسێك لە ئەورووپا دەیەوێت لە بوارێك لە بوارەکانی زیندەوەرزانی، بۆ نموونە کرمێکی دیاریکراو، زانیاری کۆ بکاتەوە، بزانێت کەڵکی چییە، شەش مانگ و زیاتر دەکەوێتە گەڕان و ئەملاولاکردنی مەیدانی و جۆر و ژیانیان و خواردنیان و ئیدی ورد و درشتی وابەستەی تاوتووێ دەکات، ئا بەو شێوازە داهێنان و نوێگەری و بەدەستخستنی

بابەتی گرنگ دێنە گۆڕێ. ئێمە وا دەزانین داخۆ ئەو داهێنانەی کە لە ئەورووپا کراوە، هەر وا پڕی پێدا کردووە و هێناویەتی، نەخێر، شەونخونی و ماندووبوونی زۆر هێناویەتیە کایەوە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت دەمودەست پەیدا ببێت. تۆ لە گەنجی خۆمان بڕوانە، ئەمڕۆ دادەمەزرێت و دەیەوێت سبەی ببێتە بازرگانێکی گەورەی ملیاردێر، ئەمە بۆچی؟ چونکە کەسێکی تەنبەڵە، خاو و بێتوانایە، بێزارە و هەوڵ نادات و ئەوەی بەلایەوە گرنگە مووچەیەکی هەبێت و ببێت بە بندیوار، کە گەنج نابێت وا بێت.

قۆناغی سێیەم: قۆناغی ئیلهام. ئەو قۆناغەیە تا گەنج دەگاتە ئاستی داهێنان. زانیارییەکانی کۆ کردەوە و دوای خەملاندنی لە بیری خۆیدا و پاشان گەیشتە ئەوەی لەو بابەتەدا چی دەکات، یان دەیەوێت بە کوێ بگات و چۆن هەنگاوێ بنێت.

بەداخەوە زۆرینەمان ئەو قۆناغانەمان نەبڕیوە، بۆیە شتەکانمان زۆربەی لاساییین، لە فەیسبوك بڕوانە زۆربەی هەرە زۆری گەنج شتەکان بە جۆرێکی لاسایی دەیکات، لە پەیجەکانی سۆشیالمیدیادا دەبینیت هەموو بابەتەکان بە نووسراوەوە لاساییە و بە وێنەکانەوە لاساییە و بە باسە ئایینییەکانیش هەموو لاسایی ڕۆیشتووە، نایەن شتی نوێ و نەدیتراو بهێننە گۆڕێ و کەمێك خۆیان ماندوو بکەن. تەنانەت تا جلێك دەگۆڕێت، زۆر بەزەحمەت دەیگۆڕێت، تا قسەیەکی دەگۆڕێت، زۆر دەبات بگات بەو تێڕوانینەی بەلایەوە ئاسایی بێت بیگۆڕێت. هۆکارەکەی ئەوەیە گەیشتووەتە ئاستێك کە شەرم دەکات، یان قاڵبی گرتووە پێیەوە و نە وا دەکات زانیاری کۆ بکاتەوە و بیخەملێنێت، نە وا دەکات خواستی نوێگەری بکات و لەو پێناوەدا هەنگاو بنێت.

## پێکهاتە و بنەماکانی داهێنان

زانایان گەیشتوونەتە دەرئەنجامێك کە هەندێك بنەمای بنچینەیی هەن کە ژمارەیان شەش دانەیە، گرنگن بۆ ئەوەی گەنج بتوانێت داهێنان بکات.

لە شوێنێکی وەك ئەورووپا کەسێك بۆ نموونە سەرتاشی دەکات، دەیکاتە بزنس و داهێنانی تێدا دەکات. پێڵاوفرۆشە، دەیکاتە بزنس و داهێنانی تێدا دەکات. مۆبایلفرۆشە... هتد. واتە بۆ ئەوەیە کە بیکاتە یەك لە کارە سەرەکییەکانی خۆی و لە داهاتوودا زۆرترین بەرهەم لەو بوارەدا پێشکەش بکات. کەواتە ئەو کەسانەی کە داهێنان دەکەن، دەبێت ئەم بنەمایانە وەك پێویست لەبەرچاو بگرن:

پێویستی و بنەمای یەکەم: ئەو کەسانەی کە داهێنان دەکەن، هەست بەوە بکەن کە گرفتێکی کۆمەڵگا بەم داهێنانە چارەسەر دەکەن، یان خزمەتێك بە تاك و کۆمەڵگا دەکەن.

بۆ نموونە: شاشەی تەلەڤزیۆنەکان، لەوانەیە چاوی کەسەکان ماندوو بکات، سەرەتا ئەو دەیەوێت بیر لەوە بکاتەوە کە چۆن شاشەیەك دروست بکات لە داهاتوودا خزمەت بە خەڵکی بکات و چاویان ماندوو نەکات.

یان کەسێك دەیەوێت لە مزگەوتدا خزمەتێك بکات، دەڕوانێت ئەو بڵندگۆیانەی کە هەن وەك پێویست کەڵك ناگەیەنن، ئەم کەسە دەیەوێت شتێک دروست بکات ئەو ناتەواوییە چارەسەر بکات و زۆر بە باشتر ئەو کارانەی پێ ئەنجام بدرێت.

یان گەنجێك دەیەوێت بانگخوازی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بکات، بنەمای یەکەم بریتییە لەوەی گرفتێك هەیە بۆ گەیشتن بۆ بانگخوازی و دەبێت لەوێوە دەست پێ دەکات، بۆ نموونە فێربوونی زمان، ئەو دێت لە زەینی خۆیدا گرفتەکە دیاری دەکات، بۆ ئەوەی بتوانێت تایبەتمەندی و دیاردەکانی داهێنانی تێدا دەربکەوێت و ئەنجامی بدات.

پێویستی و بنەمای دووەم: کۆکردنەوەی بیرۆکەکان. واتە هەر بابەتێك کە تۆ دەتەوێت داهێنانی تێدا بکەیت، دێیت کۆمەڵێك بیرۆکە کە پەیوەندیی بەو بابەتەوە هەیە؛ کۆیان بکەیتەوە و بیکەیتە پێڕێك بیرۆکەی کۆکراوە، چونکە هەر یەکێك لەو بیرۆکانە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی تۆ داهێنان بکەیت، ئەمە زۆر بنچینەییە بۆ داهێنان.

پێویستی و بنەمای سێیەم و سەرەکی: نەرمونیانی و مرونەت. دەبێت کەسی داهێنەر زۆر مرونەتی هەبێت، واتە توانای ئەوەی هەبێت بە داهێنانێکی نوێ دەستی بخات، چونکە زۆر شت هەیە کە وەکوو نەریت ساڵانێکی زۆرە وەرمانگرتووە و ناتوانین لێی لا بدەین، کە لێی دەڕوانین هەر لاساییە و زیانی هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بووەتە لاسایی، ناتوانین لێی بترازێین. بۆیە دەبێت مرونەتێکی باشی بواری داهێنان هەبێت، واتە داهێنان بەبێ مرونەت لەگەڵ واقیع، مرونەت لەگەڵ تەکنەلۆژیا، مرونەت لەگەڵ توندگیری... هتد؛ زۆر گرنگە، بۆ نموونە توندگیری زۆر پێویستی بە مرونەت هەیە.

ئەم بابەتانەی کە باسمان کردن، هەموویان پێویستیان بە مرونەت هەیە، تەنانەت فیقهی ئیسلامی پێویستی بە مرونەت هەیە، تێگەیشتن لەوە پێویستی بە مرونەت هەیە، بۆیە دەبینیت داهێنان لەوەدا ناکرێت، چونکە مرونەت لەوەدا نییە، بێگومان داهێنان بەبێ مرونەت ناکرێت.

پێویستی و بنەمای چوارەم: ڕۆشنبیری لە چوارچێوەی کارەکان و ڕێکخستنیان. یەك لە گرفتە گەورەکانی ئەمڕۆی گەنج، ڕۆشنبیریی بواری کارگێڕی و ڕێکخستنی ژیانی زۆر لاوازە. دەیبینیت چەند ساڵ لەناو کاری ڕاگەیاندندا نەیتوانیوە کارەکانی خۆی ڕێك بخات و بەتۆکمەیی پۆلێنی بکات و ئاراستەی بکات، واتە ڕۆشنبیرییەکی قووڵ لەو بابەتەدا جەم بکات، سەرەتا و کۆتایی و هەنگاو و ئامانجی دەستنیشان بکات. بۆیە پێکهاتەی بنەڕەتی بریتییە لە ڕێکخستنی کارە ڕۆشنبیرییەکانی خۆت، بۆ ئەوەی لەم گۆشەیەوە چاك هەنگاو بنێیت.

پێویستی و بنەمای پێنجەم: بیرۆکەی تازە و نوێگەری. بریتییە لەوەی تۆ دەبێت

بیرۆکەی داهێنانت هەبێت، بۆ ئەوەی بەردەوام هەوڵ بدەیت شتی نوێ دەست بخەیت، تەنانەت ئەگەر شکستیش بهێنێت و بەر بیتەوە و بیشکەویت؛ هەر دەبێت هەستیتەوە.

دەبێت ئەم پێنج بنەمایە وەك بنەمای بنەڕەتی لێیان بڕوانیت و دەستیان پێوە بگریت، بۆ ئەوەی بتوانیت داهێنان بکەیت.

ئەگەر ئێستا تۆ لە گەنجێک بپرسیت و بڵێی بۆ داهێنان ناکەیت، بێگومان دەڵێت داهێنانی چی بکەم، من دۆخم خراپە و بێکارم و بێدەستکەوتم و ژینگە ڕێگەم نادات و لاسایی ناهێڵێت و هیچم پێ ناکرێت، بەڵام ئەوانە هیچیان نابێت ببنە ڕێگر و بەبێ وەستان دەبێت ئەو هەنگاوانە ببڕێت و متمانەی تەواوی بە خۆی هەبێت و بڕیار بدات. لێرەدا ڕێگرەکان باس دەکەین، بۆ ئەوەی تۆ لەوانە دوور بکەویتەوە:

## ڕێگری و لەمپەرەکانی بەردەم داهێنان و نوێکاری

ئـ. نەبوونی متمانە: بێمتمانەیی نەخۆشییەکی سەردەمە لە جیهانی ئیسلامیدا. ئەوەی کە ئەورووپا دەیکات، بریتییە لە بوونی متمانە بە خۆیان، بەڵام بەپێچەوانەوە لەلای ئێمە متمانە نییە، بۆیە ناتوانین داهێنان بکەین. ئەوەش بۆخۆی لەمپەرێکی گەورەیە.

ب. نەبوونی بوێری و ترسان لە شکست: هیچ پرۆسەیەکی داهێنان بە یەك جار سەرکەوتوو نابێت، کەواتە هەر ئەو شکستە؛ سەرکەوتنە. هەموو داهێنانەکان سەرەتا شکستیان هێناوە. وەك دەگوترێت ئەدیسۆن کاتێك کارەبای داهێنا، هەزار جار شکستی هێنا، ئینجا سەر کەوت. گەنجی ئێمە ئەوەندە لە شکست دەترسێت، بە یەك جار لە هەنگاوەکە دوور دەکەوێتەوە، بە بیانووی سەرنەکەوتن و شکستەوە، کەواتە بوێر نییە و لە شکست زۆر دەترسێت، بووەتە لەمپەرێکی گەورە. زۆر کەس هەن کە شکست دەهێنن، یەکسەر بەجێی ناهێڵن و دووبارەی دەکەنەوە.

پ. لە هەموو خەڵکانی دیکە سەرکەوتووتر دەبێت، چونکە شکست سەرەتای هەستانەوەیە، شکست سەرەتای داهێنانە.

ت. دەستنیشاننەکردنی ئامانج: زۆر جار کەسەکان ئامانجیان دەستنیشان نەکردووە، بۆیە کە لێی دەپرسیت سەبارەت بە ئامانج و هەنگاو، دەبینیت هیچی نەکردووە و متمانەشی بە خۆی نییە هیچ بکات، ئەمە ترسناکە، چونکە کەسەکان دەبێت لەم ژیانەدا دارای ئامانج و مەبەست بن. کە تۆ هیچت لێ دیار نەبێت، ناتوانیت داهێنان بکەیت. دەبێت لە سەرەتاوە شتێك دەستنیشان بکەیت، بۆ نموونە: من دەمەوێت کامێرامانێکی بەهێز بم، دەمەوێت لە کۆمپیوتەر زۆر بەهێز بم، دەمەوێ ڕۆژنامەنووسێکی کارا بم، دەمەوێت پەرلەمانتارێکی بەتوانا دەربچم، کەسێکی کارگێڕیی بەهێز بم لە ئایندەدا؛ ئەوە هەمووی دەستنیشانکردنی ئامانجە. ئەگەر ئامانجت هەبوو، ئیتر کار بۆ ڕۆژنامەنووسییەکەت دەکەیت، کار بۆ بوون بە پەرلەمانتارییەکەت دەکەیت، کار بۆ ڕاگەیاندنکارییەکەت دەکەیت، ئیتر بەو شێوەیە بۆ هەر ئامانجێك کە دەستنیشانت کردبێت؛ کاری بۆ دەکەیت. دەبینیت ڕێگایەکی باشت بڕیوە و لە ئامانجەکەت نزیك بوویتەتەوە.

ج. ترسان لە قسەوقسەڵۆك و کۆمەڵگە: خاڵێکی دیکە بریتییە لە ترسان لە کۆمەڵگە، ئاخۆ دەبێت کۆمەڵگە چۆنم لێ قەبووڵ بکات و چیم پێ بڵێن، من نەریت و دنیاکەم جیاوازە و دەوروبەر و کۆمەڵگە قسەم لەسەر دەکەن، پێیان پەسەند ناکرێت و دانی پێدا نانێن، یان لەلای کۆمەڵگەی ئێمە عەیبە وەکوو شەریعەت و ئایین سەیر دەکرێت. ئەوەندە کاریگەریی بەسەرەوەیە: ئەمە ناکەم؛ عەیبە، ئەو هەنگاوە نانێم لەبەر عەیبە، لە کاتێکدا شتەکە هیچ ناشەرعی و نادروستییەکی تێدا نییە، ئەوە یەك لە ڕێگرەکانە و دەبێت بیسڕیتەوە و لای ببەیت.

ح. نەبوونی هاندان و پشتیوانی: سروشتی مرۆڤ وایە حەز بە هاندان و پشتیوانی دەکات، بۆیە قورئان بۆ بواری ژیان و عیبادەت دەیان و سەدان ئایەتی هێناوە، هانی مرۆڤ دەدات تا هەنگاو بنێت. کەواتە هاندان غەریزەیەکی سروشتیی ناخی هەموو مرۆڤەکانە و کاریگەریی زۆری لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤ هەیە. گەنجی ئیمە هان نەدراوە، بۆیە بەردەوام ڕووی لە چوونەدەرەوەی وڵاتە، توانا و وزەی خۆی هیچ لەبەرچاو نەگرتووە.

خ. نەبوونی خولیا و خواست: هەموو مرۆڤێك لە ژیاندا کۆمەڵێك ئامانج و حەز و خولیا و خواستی هەیە، ئەم خولیایانە وای لی دەکەن هەنگاو بنێت و بچێتە پێشەوە. کاتیك گەنج پشت لە خواستەکانی دەکات و گرنگیی پێ نادات، کەسێکی تەنبەڵ و بێسوودی لی دەردەچێت، ناگاتە هیچ ئامانجێك.

د. حەماسەت و گەرموگوڕی: ژیان ناخۆشی و ناسۆریی زۆری تێدایە، ئەگەر توانای لێ وەگەڕ نەخەیت و بەجۆشوخرۆش نەبیت؛ بەسەرتدا زاڵ دەبێت و گیرۆدەی دەستی گرفت و ناخۆشی و نارەحەتییەکان دەبیت، بەپێچەوانەوە ئەگەر خاوەنی حەماسەت و گەرموگوڕی بیت، باشترین خزمەت و خۆشی پێشکەش بە خۆت و دەوروبەر دەکەیت. لە کاتی گەڕان بەدوای چارەسەری پەتای کۆرۆنادا، سەنتەرێکی ئەمەریکی گوتبووی تا ئێستا ئێمە یەك ملیۆن ئەزموونمان لەسەر ڤاکسینی نوێی کۆرۆنا کردووە و لە هەموویاندا شکستمان خواردووە، بەڵام هەر بەردەوامین. ئۆکسفۆرد، پێم وایە بیست و حەوت هەزار جار ئەزموونی لەگەڵ وڵاتان و تاقیگەی جیاجیادا ئەنجام دا، لە کۆتاییدا سەر کەوت.

داهێنان دەبێت بەگەرموگوڕییەوە بکرێت و جددییەت و سووربوونی تێدا بێت، بۆیە زۆر گرنگە ئێمە بتوانین ئەم گەرموگوڕییە لە چوارچێوەی داهێناندا گەشە پێ بدەین.

ئەمڕۆ یەك لە ڕێگرە گەورەکانی بەردەم گەنج ئەوەیە کە گەرموگوڕیی بۆ هیچ نییە، بۆ نیشتمان گەرموگوڕیی نییە، بۆ کۆمەڵگە نییەتی، بۆ بەرەوپێشبردنی خۆیشی گەرموگوڕیی نییە، ئەمە کارەساتێکی گەورەیە.

ئەی گەنج، ئەگەر ئێمە زانیمان داهێنان چەندە گرنگە، ئەگەر بنەماکانی داهێنان لە خۆماندا هەبن، بڕیار بدەین، جێبەجێیان بکەین، ئەگەر توانیمان لەو کێشە و گرفت و ڕێگرانەی دێنە پێشمان ڕزگارمان ببێت، ئەوە بێگومان دەتوانین داهێنان بکەین.

ئەی گەنج، ئەو کەسەی داهێنان دەکات؛ لە تۆ بەتواناتر و عەقڵی لە تۆ زیاتر نییە، شتێکی لە تۆ زیاترە، ئەو متمانەی بە خۆی هەیە و تۆ متمانەت بە خۆت نییە، ئەو هەوڵ دەدات و تۆ هەوڵ نادەیت، ئەو گرنگیی داهێنان باش دەزانێت و تۆ هیچ بایەخ و گرنگیی پێ نادەیت.

## تەوەری هەشتەم: ئارامیی هزر

مرۆڤ پێك هاتووە لە هزر. ئەگەر بیر ئارام بوو، ئاسوودە بوو، لە چوارچێوەیەکی ئاسوودەدا ژیا و تووشی هیچ پاڵەپەستۆیەك نەبوو، بێگومان بیرکردنەوە و تێڕوانین و ئەنجام و دەرئەنجامەکانی زۆر باش دەبن.

جیهانگیری فشارێکی زۆری لەسەر دید و هزر دروست کردووە. مرۆڤ بەگشتی و گەنجیش بەتایبەتی پێویستی بە کەشێکی ئارام هەیە، بۆ ئەوەی هزر و دیدی ئاسوودە بێت. لاتان زانراوە لە شڵەژاوی و نائارامیدا دەژیین و چەندین گەنجمان هەیە لەو دنیای جیهانگیرییەدا ناتوانن هیچ داهێنانێك بکەن، بەڵکوو لەسەر شەقامەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆیان قاڵ و سەرمەست کردووە و خەریکی ماددەی هۆشبەر و ئەو کارە خراپانەن کە هزر و جەستە و تەواوی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیشی شێواندوون، کە ئەوەش لەبریی ئاسایشی هزری، بێهۆشی کردوون، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تا ئاستێکی زۆر جیهانگیری ئاسایشی هزری تووشی شڵەژانێکی زۆر کردووە، لەناو ئەوانیشدا گەنج و لاوەکان.

ئاسایشی فیکری زاراوەیەکی نوێیە و لەم سەردەمەدا پەیدا بووە، بۆیە ڕای جیاواز هەیە لە بارەی پێناسەی ئاسایشی هزرییەوە.

زانایان هەندێکیان دەڵێن سەلامەتیی فیکریی مرۆڤ واتە: "سلامة فكر الإنسان وعقله وطريقة فهمه وحفظها من الإنحراف عن الوسطية والإعتدال فيما يخص الجوانب الثقافية والإجتماعية والعقائدية والدينية"، واتە: "سەلامەتیی هزر و عەقڵی مرۆڤەکانە، ڕێگای تێگەیشتن و پاراستنیان لە لادان لە ڕاستەڕێی ئیسلام، هەروەها هاوسەنگی لە بارەی لایەنە گشتییەکانی وەك ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕ و ئایینە".

کەواتە گەنج فیکر و هزری لە لادانی فیکری و توندوتیژی و لادانی باوەڕی و بەهای ئەخلاقی و بوارە کۆمەڵایەتییەکان پارێزراو بێت. بە فیکری ئارام و ئاسوودە،

گەنج دەتوانێت سوود لە دنیای جیهانگیری وەربگرێت و دوور بکەوێتەوە لە لایەنە نەرێنی و خراپەکانی.

هەر کاتێک لایەنی هزریی گەنج تێك چوو، شڵەژا و تووشی توندڕەوی بوو، وڵاتە زلهێزەکانی خاوەنی جیهانگیری بەئاسانی توانا و وزەی گەنجەکانمان ئیستغلال دەکەن و بەهەدەریان دەدەن، چونکە ئەوان دەزانن وڵات واتە گەنج و داهێنان و پێشکەوتن و ئابووری واتە توانای گەنج.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: ئایا ئێمە بۆ پاراستنی ئاسایشی هزری و بۆ پاراستنی ئارامی و ئاسوودەیی هزریمان، هەوڵ بدەین دەرگا لەسەر خۆمان دابخەین؟ کەڵك لە دنیای جیهانگیری وەرنەگرین و لەگەڵیدا هەڵنەکەین، دەرگاکانی ئینتەرنێت و تەواوی بوارە تەکنەلۆژییەکان لە خۆمان دابخەین؟ نەخێر، بێگومان ئەوە هەڵەیەکی زۆر ستراتیژییە.

دەرگا بەسەر خۆماندا لە دنیای جیهانگیریدا دەکەینەوە، ورد دەبینەوە کامیان لەگەڵ پرەنسیپەکان و بیروباوەڕ و وزە و توانا و بنەماکانی وابەستەیی نیشتمانی و خەڵك و کۆمەڵگای ئێمە دەگونجێت، ئەوەیان قەبووڵ دەکەین، چونکە ئێمە بڕوامان بە وابەستەییەکی شارستانی هەیە کە هەمووان تێیدا کۆ ببنەوە و خزمەت بە مرۆڤایەتی بکەن و نەگۆڕەکانمان پارێزراو بن و گۆڕاوەکانیشمان لەسەر ئەو بنەمایە بن کە سوود بە نەگۆڕەکان بگەیەنن. بۆیە دەڵێین بەڵێ، ئێمە دەرگامان بۆ هەموو تەکنەلۆژیایەکی سەردەم و گەشەیەکی بواری تەکنەلۆژی کراوەیە، بەڵام بە پێی ئەو پێوەرانەی کە هەمانە.

## ئەی گەنج، ئاوا بیر بکەرەوە!

خەڵکانێک وا بیر دەکەنەوە کەسانێکی ئایینی تیڤی و ئینتەرنێت لە ماڵەوە هەڵدەگرن و منداڵەکانیانی لێ بێبەش دەکەن بە هۆکاری ئەوەی ئەمنی هزرییان پارێزراو نییە، ئەوەش هەڵەیە، چونکە ئاسایشی هزری بەوە دەپارێزرێت کە کۆمەڵێك نەگۆڕی بۆ دانرابێت و دەرگاش بکرێتەوە ئەوەی کە بەهادارە و خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات، ئەوە قەبووڵ بکرێت.

ژیانی تاك و گەنجی گۆڕی، واتە شێوازی ئێستای هەموو تاك و گەنجێك لەگەڵ دە ساڵ لەمەوپێش، جووڵە و هەڵسوکەوت و قسە و تەنانەت خەوتن و هەستان و خواردن و جلیشی، هەمووی گۆڕاوە لەژێر کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

دووەمیان پەیوەندیی کۆمەڵایەتییە. ئێستا هەمووان ئەو پەیوەندییەیان گۆڕاوە و وەکوو جاران نییە، بەڵکوو شێوازێکی تری وەرگرتووە. ئەگەر بێت و لە بیست ساڵی پێشوو بڕوانین، دەبینین پەیوەندیی کۆمەڵایەتی زۆر جیاوازترە لەو پەیوەندییەی ئێستا لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوەیە.

خاڵێکی تر بریتییە لە لاساییکردنەوە. بۆ نموونە؛ دەبینیت گەنج لەبەر ئەوەی زۆرێك دەبینێت وا دەکەن و وا لەبەر دەکەن و وا فەیسبوك بەکار دەهێنن، ئەویش وەك ئەوان دەکات و ئولفەتی پێوە دەگرێت و لاساییان دەکاتەوە، بەڵام دەبێ ئاگاداریشی بین، ئینتەرنێت پێشەنگی هەموو ئەو داهێنانانەیە کە ژیانی مرۆڤی هەموو گۆڕیوە و کاریگەریی لەسەر هەڵسوکەوتی تاك و خێزان و کۆمەڵگا هەر لە سادەترین شتەوە تا دەگاتە لایەنی پەیوەندی و ئایینی و تەنانەت سیاسییش دروست کردووە.

## بایەخ و گرنگیی ئاسایشی هزری
## بۆ تاك و بەتایبەتی بۆ گەنج

دیارە ئێمە باس لە گرنگیی ئاسایشی هزر و بیر بۆ گەنج دەکەین، چونکە ئەگەر گەنج هزری ئارام و ئاسوودە بێت، ئەو کاتە دەرگایەکی ڕاستەقینە دەبیت بۆ داهێنان، چونکە وڵاتی ئێمە دەناڵێنێت بەدەست نەبوونی داهێنانەوە، بەدەست بەهەدەردانی وزەی گەنجەوە.

دووەم: ئەگەر بتەوێت گەشە بە شارستانیەت و مەدەنیەت و ژینگە و کۆمەڵگە و خوێندنەوە بدەیت، بێگومان دەبێت ئاسایشی هزری فەراهەم بکەیت.

سێیەم: کۆمەڵگە دەپارێزرێت، بەتایبەتییش گەنج. وەك گوتمان دنیای جیهانگیری شڵەژانێکی گەورەی بەدوای خۆیدا هێناوە و دەیان و سەدان گەنجی بەلاڕێدا بردووە، جاری وا هەبووە هێڵی دوور لە ئایین و جاری واش بووە بە ناوی ئایینەوە، گەنجەکانمان ئاسایشی فیکرییان تێك چووە و وزەیەکی زۆرمان لەدەست دەرچووە، بۆیە پارێزگاریکردن لە کۆمەڵگا بەوە دەکرێت کە ئاسایشی هزریی گەنجان بپارێزین.

خاڵی چوارەم: لە چوارچێوەی جیهانگیریدا هزری لادەر و خواروخێچ زۆر بوون، بەتایبەت دامەزراوە و ڕێکخراوی گەورە و ماددە و پاڵپشتییەکی یەکجار زۆر پێشکەش دەکرێت، بەتایبەت ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بۆ ئەوەی گەنجانمان تووشی لادان و خواروخێچی بکەن لە هەر بوارێکدا بێت. ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە کاریگەرییە بنچینەییەکانی گرنگیی هزری جیهانگیری.

ئەگەر بە دیوێکی دیکەدا ببینین، ئەگەر ئاسایشی هزری نەبوو و ئەو ئاسایشە تێك چوو و کێشە پەیدا بوو:

یەکەم: هەموو لایەنەکانی ژیان بە ئاسایشی فیکرییەوە بەستراونەتەوە. واتە هەر

کاتێك لـە کۆمەڵگایـەك گەنجـەکانمان ئاسایشـی هزرییـان تێـك چـوو، کۆمەڵگـە دەشڵەژێت و تەواو تێك دەچێت.

دووەم: ئەو کاتە کاریگەریی هزری زیاتر بەرەو ئەوە دەڕوات زیان بە کۆمەڵگە بگەیـەنێت. واتـە گەنجـەکان لـەبریی ئـەوەی کـەڵکیان بـۆ کۆمـەڵگا و خێـزان و بـۆ بوارەکانی دیکە هەبێت، زیانیان دەبێت.

سێیەم: ژیرییەکان کە سەرچاوەی داهێنانن؛ تێك دەچن، چونکە کاریگەریی هزر ڕاستەوخۆ لەسەر عەقڵە. ئەوەی هزری ئارام بێت؛ عەقڵی ڕاست و دروست دەبێت، ئەوەی هزری شێواو بوو، ئەوا بێگومان ژیرییشی لەدەست دەدات.

چوارەم: ئەنجامـدانی تـاوان. لـە هـەر کۆمەڵگایـەك ئاسایشـی هزریـی گـەنجان تێـك چـوو، بـە هەر پاڵنـەرێک بێـت، دەسـت دەدەنە ئەنجامـدانی تـاوان. ئـەوەتا کۆمەڵێك جووڵانەوەی توندڕەو لە ئەورووپا سەریان هەڵداوە، دەچنە سەر قوتابخانە و مزگەوت و باخچەی منداڵان و ناو بازاڕەوە و خەڵك دەکوژن و خراپەکاری دەکەن. یاخود بە شێوازێکی تر و ئەو کاتەی بەئاشکرا جۆرێك لـە توندڕەوی و زیادەڕەوی لە هەموو شتەکان لەبەر چاوی گەنجان جوان دەبێت و جێبەجێشی دەکەن.

## مەبەست لە ئاسایشی فیکریی گەنج چییە؟

١. ڕۆڵی لە بەرقەراربوونی ئاسایشی هزر: پرەنسیپ و بەها بنەڕەتییەکانی کە باوەڕ ڕۆڵی تێدا دەبینێت، بە ئاسایشی فیکری قـووڵتر دەبێتـەوە و جێگیرتـر دەبێت، چونکە ئەگەر باوەڕ شڵەژا، ئەوانی دیکەش دەشڵەژێن.

٢. بوونی وابەستەبوون: لەلاتـان زانـراوە کـە خەڵك بەگشـتی و گـەنج بەتایبـەتی، بـە هـۆی سـەرقاڵبوونی بـە دنیـای جیهـانگیری و تـۆڕە کۆمەڵایـەتییەکان و سەرگەرمییەکانی دیکەوە، وابەستەبوونی بۆ خێزان و کۆمـەڵگا و شار و نیشتمان و خاك و ئایینەکەی شڵەژاوە.

گـەنجێك کـە لـەسـەر جـادە دانیشـتووە و دەخواتـەوە و مـاددەی بێهۆشـکەر بـەکار دەهێنێـت، لێـی بپرسـە هەستوسـۆز و وابەسـتەبوونت بـۆ کۆمەڵگەکـەت، بـۆ

نیشتمانەکەت و بۆ ئایینەکەت و بۆ دەوروبەرت چۆنە، بێگومان هیچی نییە، چونکە ئاسایشی هزریی پارێزراو نییە.

جا کاتێك تۆ دێیت و دەتەوێت ئاسایشی فیکری بەرقەرار بکەیت، بێگومان بۆ جارێکی دیکە ئەو وابەستەییە لەناو دڵ و دەروون و ژیریی ئەو گەنجەدا جێگیر دەبێتەوە.

**٣.** بیرکردنەوەی ڕاست و سەقامگیر و مامناوەند: ئامانج و مەبەستێکی گەورەی تر لەپاڵ ئاسایشی هزری ئەوەیە کە گەنجەکانمان بیرکردنەوەیەکی ڕاست و جێگیر و سەقامگیریان دەبێت و ناوەند دەبن، نە زیادەڕەوی و نە کەمتەرخەم دەبن، نە توندڕەوی و نە شلگیری، بەڵکوو بە ڕێگایەکی ڕاستدا دەڕۆن و بیرکردنەوەیان بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروستە.

**٤.** پارێزبەندیی هزری: پێویستمانە گەنج پارێزبەندیی هەبێت، واتە دامەزراو بێت لە ڕووی هزرییەوە، چونکە ئەو ڕەوت و تەیارانەی دێن و ڕوو لە گەنج دەکەن هەر ڕۆژەی بە ناوێکەوە، ڕۆژێك بە ناوی عەلمانیەت و ڕۆژێك بە ناوی لیبراڵیەت و ڕۆژێك شیوعیەت... هتد، ئەگەر بێت و پارێزبەندییان نەبێت، ئەوا کاریگەریی نەرێنیی زۆر خراپی دەبێت.

**٥.** پەروەردەی دروست: پەروەردە لە قۆناغی لەدایکبوون و منداڵی تا دەگاتە ١٢ ساڵ دەست پێ دەکات، دایك ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەبێت، ئەگەر ئاسایشی فیکری نەبێت، ئەوا بێگومان پەروەردە نابێت لەسەر ئەو ڕێگا و ئاڕاستە ڕاست و دروستەی کە دەتەوێت لە داهاتوودا بەرهەمهێن و خاوەنی بەهرە و داهێنان بێت، بەڵکوو پەروەدەکەشی لاواز دەبێت.

**٦.** بیرکردنەوەی دروست: هەموو کارێك سەرەتا بە بیرکردنەوە دەست پێ دەکات، ئەگەر بیرکردنەوەکە دروست بوو، بێگومان کردەوەکانیش دروست دەبن، بەپێچەوانەوە، ئەو گەنجەی لەسەر فیکری توندڕەوی پەروەردە دەبێت، بێگومان هەر توندڕەوییش بەرهەم دەهێنێت.

**٧.** هاوکار و یارمەتیدەر: بەرهەمی ئاسایشی فیکری لەلای گەنج، یارمەتیدان و

هاوکارییە. هاوکاری بنەمایەکی گرنگی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرمانە. ئێستا گەنج بە هیچ شێوەیەك بیر ناکاتەوە هاوکار بێت، بۆ خۆی و بۆ دراوسێ و بۆ دۆست و دەوروبەری. ئاسایشی فیکری وا دەکات گەنجێکی هاوکاری لێ دەربچێت و هاوکاریی خۆی و دەوروبەری بکات بە شێوازێکی مرۆڤانە.

٨. بوغز و قینلەدڵی: نەخۆشییەکی کوشندە لەناو گەنجانماندا پەیدا بووە، بەتایبەتی گەنجی توندڕەو، ئەویش قینلەدڵی و دڵڕەقییە لەگەڵ دەوروبەر و بەرانبەرەکانی. گەنجەکانمان بۆ یەك کینەیان هەیە و دابڕانیان هەیە و دوور لە یەك دەگرن و بچووکترین شت ئاستی کێشە و ئاڵۆزییەکانیان زۆر گەورە دەکات و هەندێک جار دەگاتە کوشتنیش، ئەمە بە هۆی ئەوەوەیە کە ئاسایشی فیکری فەراهەم نییە. بێگومان کە ئەوە هاتە گۆڕێ، ئیدی گەنجەکانمان دوور دەکەونەوە لەو جۆرە هەڵسوکەوت و دژیەکییە.

٩. بیناکردنی بەرپرسیاریەتی لە ناخی گەنجدا: نەبوونی ئاسایشی هزری وای لە گەنج کردووە هیچ هەست بە بەرپرسیاریەتی نەکات. ئەگەر لێی بپرسیت بەرپرسیاریەتیی خۆت چییە، لێی بێئاگایە. ئەگەر لێی بپرسیت بەرپرسیاریەتیی خێزان و کۆمەڵگە و نیشتمان و ئایینەکەت، هیچ هەستی پێ ناکات و لەلای بایەخدار نییە. بەڵام هەر کاتێک ئاسایشی فیکری هەبوو، ئەو کاتە پێچەوانە دەبێتەوە و هەست بە بەرپرسیاریەتیی تێدا دروست دەبێت. گەنج بۆ ئەوەی داهێنان بکات، بەرپرسیاریەتی بگرێتە ئەستۆ، پێویستە هەست بە بەرپرسیاریەتی بکات، جا ئەو هەستە بۆ ئایین بێت، یان بۆ خاك و نیشتمان و کۆمەڵگەکەی. وڵاتانی پێشکەوتوو ئەو کاتە ڕۆڵی داهێنان و نوێکاری و بەرەوپێشچوون هەست پێ دەکەن و بینای دەکەن و بەرجەستەیان کردووە، بەوەی هەستیان بە بەرپرسیاریەتی بەرانبەر بە ئێستا و ئایندەی دروستکردنی مێژوویەکی جوان بۆ نیشتمانەکەیان کردووە، بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە شێوەیەکی گشتی بەرپرسیاریەتی کەمە، بۆیە تەنیا بەکاربەرین و دەخۆین و خەرج دەکەین و داهێنانمان نییە و گرنگیی پێ نادەین. ئەم خاڵە زۆر گرنگە و پێویستە زانا و نوخبە و شارەزایان و ئەهلی گەشەپێدان و بەشەکانی تر بیر لەوە بکەنەوە چۆن وا لە گەنجان بکەن هەست بە بەرپرسیاریەتی

بکەن، چۆن وا لە گەنجان بکەن کە بەرپرسیاریەتیی لەسەرشانە، بەرپرسیاریەتیی خۆی و خاك و نیشتمانەکەشی لەسەرشانە. ئەمڕۆ کە گەنج هەست بە بەرپرسیاریەتی ناکات، داهێنانی نییە و هەست بە ئەرکی خزمەت ناکات لە گەردنیدا بەرانبەر بە ئەوان، بەڵکوو زیانە بۆ خۆی و کۆمەڵگە و نیشتمان و ئایینەکەی خۆیشی.

١٠. بەرەوپێشچوون و پەرەپێدانی بەردەوام: بریتییە لە پەرەپێدانی کۆمەڵگا بەرەو باشتر؛ پزیشکی بەرەو باشتر، ئەندازیاری بەرەو باشتر، ژینگە بەرەو باشتر، دۆخی کۆمەڵایەتی بەرەو باشتر، دۆخی تەکنەلۆژیا بەرەو باشتر، پیشەسازی و کشتوکاڵی بەرەو باشتر. وڵاتی خۆمان باس بکەین، لە هەموو ڕوویەکەوە بەرەوپاشین، لەبەر ئەوەی گەنج ئاسایشی هزریی نییە، بەرچاوی ڕوون نییە و نازانێت بەرەو کوێ دەڕوات و بۆچی دەژی و داهاتوو چۆن دەبێت.

ئەمانە کۆمەڵێك خاڵ بوون، تا پێتان بڵێین ئاسایش و پاراستنی فیکری گەنجەکانمان زۆر گرنگن و ئەرکی سەرشانی نوخبە و مامۆستایانی ئایینی و کەسانی دڵسۆزە. بۆیە دەڵێم مامۆستای ئایینی، چونکە مامۆستا خاوەنی گوتارە و گەنج گوێی لێ ڕادەگرێت و بەقسەی دەکات. بەداخەوە مامۆستای وا هەیە هەر بۆ لایك و کۆمێنت دەیان و سەدان گەنج بەلاڕێدا دەبات، تووشی تێکدانی هزریان دەکات و ئاسایشی فیکرییان تێك دەدات. نموونەی داعش ڕووداوێکی زیندووە، کە سەدان گەنجی کردە قوربانیی هزر و لەناوی بردن. گرووپێکی توندڕەو و لادەر لە ڕێی خودا و پێغەمبەر و شەریعەت، ماڵوێرانیی بۆ وڵات و موسوڵمانان هێنا و کارەساتی تووشی جیهانی ئیسلامی کرد.

## تەوەری نۆیەم:

## بەرپرسیاریەتیی پاراستنی ئاسایشی هزری

ئایا کێ بەرپرسیارە بۆ فەراهەمکردنی ئاسایش و ئارامی و ئاسوودەیی بۆ دید و هزری گەنجەکانمان:

**١.** دامەزراوە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی: بێگومان ئەم بەرپرسیاریەتییە بەرپرسیاریەتیی تاکەکەس و یەك دامەزراوە و یەك دامودەزگاش نییە، چونکە ئەمە بەرپرسیاریەتییەکی زۆر گەورەیە، بۆیە بە پلەی یەك دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمڕۆ کە زۆر زۆر گەشەی کردووە و فراوان بووە و لە وڵاتی ئێمەشدا ڕۆڵیان هەبووە. هەر چەندە تەماشا دەکەم ئەم بوارە گرنگیی پێ نادرێت، یان گرنگیی پێ دەدرێت لە لایەنێکەوە، بەڵام لە دەیان لایەنی دیکەوە ناتەواوی بۆ ئەم بابەتە دروست دەکرێت، یان کەسەکان و نوخبەکان بۆخۆیان ناتەواویی ئاسایش و ئەمن و بواری ئاسوودەیی فیکرییان هەیە. بۆیە پێویستە دامەزراوە و دامودەزگا مەدەنییەکان بەردەوام هۆشیاری بڵاو بکەنەوە.

**٢.** دەزگاکانی ڕاگەیاندن: دەزگاکانی ڕاگەیاندن یەکێکە لە هەرە دەزگا کاریگەرەکان کە کاریگەریی لەسەر هەموو لایەك هەیە، بەتایبەت لەسەر گەنج. ئەمڕۆ گەنج دەتوانێت فیکری توند و ناجێگیر و شڵەژاو لە ڕاگەیاندنەکان و کەناڵەکان وەربگرێت، هەروەها دەشتوانێت ئاسایش و ئارامی و بەختەوەریی فیکری لە ڕاگەیاندنەکانەوە بگەیەنێت. بەداخەوە ڕاگەیاندنەکان لە ڕێگەی فیلم یان چەند پرۆگرام و چەند کەسایەتییەکی خواروخێچ و نەزانەوە وا دەکەن ئاسایشی هزریی گەنج تێك بدەن.

**٣.** پەروەردە و فێرکردن: پەروەردە و فێرکردن زۆر بەجددی کار لەسەر ئاسایشی فیکری گەنجان بکات، تاوەکوو پەروەردە و فێرکردن بە ئاڕاستەیەکی دروستدا بڕوات. ئەوکات بەرهەمی زانکۆ و پەیمانگاکان بێگومان زیاتر دەبێت، چونکە چەندە ئارامی و ئاسایشی فیکر بۆ قوتابییان و خوێندکاران فەراهەم بکرێت،

ئەوەندە زیاتر ڕێژەی سەرکەوتن و بەرەوپێشچوونی زیاتر دەبێت. بۆ نموونە سەیری وڵاتێکی پێشکەوتووی ئاسیایی وەك ژاپۆن بکەین، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو وڵاتە ئاسایش و ئارامیی بۆ فیکری گەنجەکانی فەراهەم کردووە، بۆیە ئەوان توانیویانە داهێنان بکەن و وڵاتی ژاپۆن بەم ئاستە گەورەیە بگات کە ئێستا دەیبینین.

٤. حکومڕانەکان: دەسەڵاتی جێبەجێکار و دەسەڵاتی حکومڕان بەگشتی ڕۆڵی سەرەکی لە ئاسایشی هزری دەگێڕن. ئەگەر دەسەڵات دەیەوێت گەنجەکان کوڕی نیشتمان بن، کوڕی کۆمەڵگا و کوڕی خێزان بن، با گرنگی بە بواری ئاسایشی هزری بدەن و فشاریان بۆ نەهێنن و دایاننەپلۆسێنن، بەڵکوو ڕێگای شتە مەترسیدارەکانیان لێ بگرن. بێگومان دەسەڵات دەتوانێت بە یەك بڕیاری تایبەتی ئاسایشی فیکری بۆ کۆمەڵگە فەراهەم بکات، بە هاوکاریی دامودەزگاکانی وەك کۆمەڵگەی مەدەنی و پەروەردە و فێرکردن و خێزان. زۆر پێویستە دەسەڵات گرنگییەکی تایبەت بەم بابەتە بدات کە ئاسایشی فیکرییە، چونکە پێش هەمووان دەسەڵات کەڵك لەم بابەتە دەبینێت.

٥. ڕۆڵی خێزان: خێزان دەبنە هەنگاوی یەکەمی ئاسایشی فیکری بۆ گەنج. دەبێت دایك و باوك خاوەنی ئامانج بن، ماڵەکە زۆر ئارام بێت بۆ ئەو گەنجە، نەك لە ماڵەوە لەبەر گرفتی دایك و باوکی بەرەو دەرەوە بڕوات و ڕوو لە ماددە هۆشبەرەکان بکات، بەڵکوو ئەم ماڵە گەنج ئاواتی پێ بخوازێت و کەڵکی لێ وەربگرێت. بۆیە گەر گەنج لە ماڵێکی ئارامدا بێت، بێگومان فیکرێکی ئارامی بۆ فەراهەم دەبێت و دایك و باوك و خێزان دەبنە پاڵنەرێکی بەهێز.

٦. دامودەزگا پەیوەندیدارەکان: خاڵێکی تر لەو خاڵانەی کە جێگەی گرنگی و بایەخپێدانە، لێپرسراویەتیی ئاسایشی فیکری لەکوێ ڕۆڵ دەبینێت، دەزگا یاساییەکانی وەك پۆلیس، ئاسایش و...، هەموویان دەبێت زۆر گرنگی بەو بوارە بدەن و نابێت ببنە بەشێك لە تێکدانی ئاسایشی فیکریی گەنجان و گەنج لە ئاسایش و پۆلیس بترسێت، بەڵکوو بە بوونی ئەوان، فیکرێکی ئارام و هەست بە بەختەوەری بکات.

٧. کاریگەرییەکانی جیهانگیری: جیهانگیری لە هەندێک ڕووەوە ئاسایشی فیکریی گەنجانی شێواندووە. دەبێت ئاگامان لەوە بێت گەنج بەو ڕێگایانەدا نەڕوات هزر و تێڕوانینی بشێوێت و تێك بچێت. هەر شتێك کە دێت گەنج وەریدەگرێت، بەبێ ئەوەی لێی بکۆڵێتەوە. هەموو شتەکان لە دەرگای جیهانگیرییەوە بۆی دێتە ژوورەوە، بەبێ پشکنین ئەو زانیارییانەی کە لەوێ هەن؛ ڕێك وەریدەگرێت، ئەوە دەبێتە مایەی توندڕەوی بۆ ئاسایشی فیکری، واتە شیرازەی هزری ئەو گەنجە تێك دەچێت.

٨. خۆخەریککردن بە شتی تەرفیهییەوە: بە پێی ئەو سەرژمێرییانەی کە هەن، زۆربەی ئەو کەسانەی کە خەریکی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانن کە بەشێکە لە جیهانگیری، خەریکی شتی تەرفیهین. بەداخەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگشتی، گەنجان بە شتی لاوەکی و تەرفیهییەوە خەریکن، واتە ئەو کەسەی بەدواداچوون بۆ ئەم شتانە دەکات، زۆر زیاترە لەوەی بەدواداچوون بۆ نووسینێکی بەهێز و ستراتیژیەتێکی بەهێز و ئامانجێکی بەهێز دەکات. یەکێ لەو خاڵە نەرێنییانەی کە بووەتە مایەی لادان و سەرگەردانی و تێکدانی بیری گەنج، ئەوەیە کە بەردەوام خەریکی شتە تەرفیهییەکانە، لەو پێناوەشدا بەها ئەخلاقی و زانیارییەکانی لەدەست دەدات. بۆیە لە وڵاتی ئێمەدا ڤیدیۆیەکی بەهێز بڵاو بکەوە، دەبینیت سەیرکەری نییە، بەڵام شتێکی بێسەنگ بڵاو بکەوە، ملیۆنان خەڵك بەدوایدا دەچێت.

٩. گۆشەگیری: گۆشەگیربوون خۆی لە خۆیدا توندڕەویی لی دەکەوێتەوە، بەردەوام بیر لە کاری نەرێنی دەکاتەوە، زۆر جار هەر لە ماڵەکەی خۆیدا خۆی دەکوژێت، ئەویش هەر بەرهەمی نەبوونی ئاسایشی هزرییە. ئەم تۆڕە گرنگەی کە پەیوەندیی خێزانیی پێکەوە بەستووەتەوە، جیهانگیری هەڵیوەشاندووەتەوە. چەند گەنجێك کە لە سەفەرێکی دوورودرێژدان، لەبەر مۆبایلەکەی دەستیان ئاگایان لە یەك نییە. یان چەند کەس پێکەوە دانیشتوون، کەچی دەبینیت زۆربەیان سەرقاڵی مۆبایلەکەی دەستیانن. نەك هەر ئەوە، زۆر جار میوانی هاتووە و میوانەکەی فەرامۆش کردووە. هەموو ئەوەش لەو زیانەوەیە کە وتمان گۆشەگیری دەکات،

دەرئـەنجامیش تووشـی نەخۆشـیی دەروونـی دەبێـت، ئـەوەش ئـەو دەرئـەنجامەیـە کـە دەیبینین و هەموو بەدەستیەوە دەناڵێنن و بـەدوای چارەسـەریدا عـەودالْن. جا ئەگـەر گەنجێك گۆشەگیر بێت و تووشی نەخۆشیی دەروونی بوویێت، ئایا چۆن دەتوانێت داهێنان بکات و بەرهەمی هەبێت!

١٠. جیانەکردنـەوەی ئـەرێنی و نەرێنییـەکان: بەداخـەوە لێکجیانەکردنـەوەی ڕووداوە ئـەرێنی و نەرێنییـەکان لـەلای گـەنج سەرلێشـێواویی دروسـت کـردووە، هـەموو سەرلێشێواوییەکیش بـۆ تێکدانی ئاسایشـی هـزری سـەر دەکێشێت. ئـەمڕۆ ڕووداو و پێشهات ئەوەندە زۆرن، زۆر ورد نەبیت ناتوانیت وەك پێویست لێکیان جیا بکەیتەوە.

١١. تێکچوونی شیرازەی گـەنج: خاڵێکی تـر لـەو خاڵـە نەرێنییانـە، توندڕەوی و دۆخی سەختی شیرازە تێکچوونە. هۆکارەکەی لە دەرهاوشتەکانی جیهانگیرییە. بۆ نموونە لە مێژووی ئەم هەزار و چوار سەد ساڵەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستدا، کوشت و بـڕین وەك ئـەم سـەردەم و زەمانـە نـەبووە. ڕۆژانـە لـە کـەناڵـەکانی ڕاگەیاندنـەوە گوێمان لـێ دەبێت ئـەمڕۆ لـە فلانـە شوێن فـلان فلانـی کوشت. لە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا بەگشـتی کۆمـەڵێك بـەهای بـەرز هـەن، بـەهای تـاك و بـەهای خێـزان و بەهای کۆمەڵگە و بـەها کۆمەڵایـەتی و ژینگـەیی و یاسـایی و بـواری فێرکردن و بەهای تەنانـەت پیشەسازی و کشتوکاڵی، هـەمووی شێوێنراوە. بۆ نموونە دنیـای جیهانگیری وای کردووە بەسادەیی بەهای ژینگـەیی تێك بدات، خەڵك ئێستا زۆر بەئاسانی ژینگە پیس دەکات، بیر لەوە ناکاتەوە ژینگە پیسکردن زیانی بۆ کەسانی دیکە هەیە. گەنج بیر لەوە ناکاتەوە ئەو کاتەی شتێك دەخوات و پاشماوەکەی فڕێ دەداتـە سـەر شـەقام، کـارێکی ناپەسـەند و نـاجۆرە. ئەمـە هـەمووی دەرئـەنجامی تێکچـوونی بـەهای ژینگەییـە. بـەهای تەندروسـتی، ئـەم بابەتـە بابـەتێکی زۆر هەستەوەری مرۆییە، کەچی ئەوەتا بازرگانی بە مرۆڤەکانەوە دەکرێت.

پێشـتر گوتمـان جیهـانگیری ئاپۆڕایـەکی گـەورەی سـەرمایەدارییە و وڵاتـی ئێمـەش بووەتـە سـەرمایەداری و پزیشـك و پیشـەوەرە گەنجەکانیشمان بـە ڕوانینێکـی سـەرمایەدارییەوە دەڕوانـن، ئەمـەش هـەمووی دەرئـەنجامی وەرگرتنـی جیهانگیرییـە بەبێ فلتەر.

١٢. نەپاراستنی شوناس: خاڵێکی دیکە لەم خاڵە خراپانە بۆ سەر گەنج، ئەوەیە کە ڕەسەنیەتی و ناسنامە و شوناسی گەنج نەماوە. بۆ نموونە لە گەنجێك بپرسە ئایا وابەستەی چ شوناسێکیت، لەوانەیە هەر نەزانێت شوناسەکەی چییە و پێناسەکەی کامەیە، بەڵام چینییەك کە شوناسێکی ناتەواو و لادەر و خواری هەیە، شانازیی پێوە دەکات، تەنانەت ساڵانە ڕۆژێکی بۆ جۆرێك خواردنی تایبەت هەیە. بە شوناسەکەی خۆی؛ ناپاکی لەگەڵ خۆی و دەوروبەر و خاك و میللەتی ناکات، چونکە هەست بە بەرپرسیاریەتی بەرانبەر بەوە دەکات کە شوناسەکەی پارێزراو بێت. ئەو شوناسەی کە هەیەتی لە مێژووی خۆی، هەموو پاراستووە تاوەکوو خاوەنی پێناسە بێت. بەڵام دەبینیت وڵاتی ئێمە، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی، خەڵکەکە نەك شوناسیان ناپارێزن، بەڵکوو سەری خۆیان هەڵدەگرن و بۆ ئەورووپا دەڕۆن و کۆچ دەکەن، چونکە ئاسایشی فیکرییان بۆ دەستەبەر نەکراوە. کە کۆچ بۆ ئەورووپا دەکەن، شوناسی خۆیان لەناو ئەورووپی و ئەمەریکی و ئەفەریقیدا بەتەواوی بزر دەکەن. بۆیە جیهانگیری دەرگای بۆ تێکەڵکردنی شوناسەکان و بزرکردنی شوناسەکان کردووەتەوە.

کۆمەڵگای تووشی لاوازییەکی بەهێزی ئابووری کردووە، چونکە تەکنەلۆژیای نوێ تێچووی هەیە. بۆ نموونە هەرماڵێك گەنجێك یان دوو گەنجی هەبێت، دەبێت مانگانە خەرجییەك بۆ ئینتەرنێتەکەی دابین بکات، بەبێ ئەوەی هیچ داهاتێکی هەبێت. بڕێك پارە مانگانە و لە بەرانبەردا داهاتی نییە، بەڵکوو ڕۆژانە بە شتی تەرفیهی و لاوەکی و سێکسییەوە خەریکە.

١٣. شڵەژانی فیکری: گەنجەکانمان تووشی جۆرێك لە شڵەژانی فیکری بوون. جاران دەیزانی ئاڕاستەی بیرکردنەوەی، شێوازی بیرکردنەوەی و هەنگاوی بیرکردنەوەی چییە، ئێستا نازانێت چۆن بیر دەکاتەوە و بۆچی و لەسەر چ بنەمایەك و ئاڕاستەی بیرکردنەوەکەی بەرەو کێیە و خزمەت بە کێ دەکات و بۆ کێی دەکات. هیچی پێ نییە، چونکە جیهانگیریی وەرگرتووە بەبێ هیچ پالافتن و هەڵسەنگاندنێك، هەموو ئەوانە ئاسایشی هزریی تێك داوە.

## خاڵە نەرێنییەکانی نەبوونی ئاسایشی هزریی گەنجان

هەر کاتێك گەنج هزری شڵەژا و لە ئارامیدا نەبوو، کۆمەڵێك خاڵی نەرێنیی زۆر مەترسیدار لەسەر گەنج بەجێ دەهێڵێت:

یەکەم: تێکچوونی سەقامگیریی کۆمەڵگا. کاتێك ئارامی و سەقامگیریی کۆمەڵگا تێك چوو، بە سروشتی سەقامگیری و ئاسایشی هەموو تاك و شتەکانی تریش تێك دەچێت.

سەرەتای ڕاپەڕینم لەبیرە، شۆفێری تاکسییەکی دراوسێی ئێمەیان بۆ جووتە تایەیەك کوشت، ئەمە هۆکارەکەی ناسەقامگیری و تێکچوونی ئاسایشی کۆمەڵگا بوو.

دووەم: گەشەی گرووپە توندڕەوەکان. مەناخێکی زۆر گونجاو بۆ ئەو ڕێکخراوە تیرۆریستانە دروست دەبێت کە لە وڵاتان گەنج بۆ خۆیان پەلکێش دەکەن، وەك گوتمان هەندێک جار بە ناوی ئایین و پاڵنەری ئایینییەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ئایینی نییە و ئایین بەو ئاڕاستەیەدا ناچێت وڵات تێك بچێت، بەڵکوو بەرەو ئارامی و ئاسایش و سەقامگیریت دەبات. وڵاتانی ئەورووپی بەشێکن لەو مەناخ و زۆنانەی ڕاستڕەوە توندڕەوەکان دژ بە موسوڵمان، دژ بە جیهانی ئیسلامی و دژ بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دژ بە گەنج تێیاندا گەشەیان کردووە و ڕۆڵی زۆر خراپ دەبینن لەو شوێنانەی کە ئاسایشی تێدا نییە.

سێیەم: وەستانی پڕۆژەکانی گەشەپێدان. پڕۆژەی چاکسازی و پڕۆژەی گۆڕانکاری، پڕۆژەکانی پەرەپێدان هەموو ڕادەوەستن. هیچ پڕۆژەیەکی گەشەپێدان لە وڵاتێکدا نابێت و سەر ناگرێت ئەگەر ئاسایشی سەقامگیر نەبێت، چونکە گەنج وزەی دەمرێت و توانای نابێت، ئەو هێزەی کە هەیەتی هەمووی لە ڕێگایەکدا بەهەدەری دەدات، لە بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەردا بەکاری دەهێنێت و بە هیچ شێوازێك گەشە ناکات.

چوارەم: تێکچوونی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی. پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ ئاسایشی کۆمەڵگا و تاك. تاکەکان و خێزانەکان پێویستیان بە لێکنزیکبوونەوە و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی هەیە، هەر کاتێک ئاسایشی فیکری تێك چوو، ئەم پەیوەندییانە نامێنێت.

پێنجەم: لەدەستدانی بەهای کۆمەڵایەتی. هەموو گەلێک کۆمەڵێك بەهای کومەڵایەتیی هەیە پێویستە پاریزگاریی لێ بکات، بەتایبەت کۆمەڵگەی ئێمە و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر کۆمەڵێك بەها وەستاون و نەگۆڕن و نابێت دەستکاری بکرێن، لە دنیای جیهانگیریدا ئەگەر فلتەر نەبوو؛ هەموو شت تێك دەچێت، بۆیە سەیر دەکەین لە ئەم ڕۆژگارەدا هەموو شت شێواوە.

هەموو گەنجێك پێویستە وەلا و بەڕای هەبێت، وەلا بۆ کێ و بەڕا لە کێ، لەگەڵ کێدا دۆست و لەگەڵ کێدا نادۆست بێت، لەگەڵ کێدا هەنگاو بنێ و لەگەڵ کێدا هەنگاو نەنێت. وەلا و خۆشەویستی بۆ خۆی و خێزان و کۆمەڵگا و دەوروبەر و خاك و نیشتمان و ئایین، دوورکەوتنەوە لەو کەسانەی کە دژی خۆی و خێزانەکەی و کۆمەڵگا و خاك و وڵات و ئایینەکەیەتی.

ئەم بنەمای وەلا و بەڕایە لە زەینی ئێستای گەنجدا یان نەماوە، یان زۆر لاواز بووە، گەنج تووشی شڵەژان و لادان بووە، نوخبە و پێشەنگ و مامۆستای ئایینی وەکوو پێویست ناتوانن کار و خیتابیان لەسەری هەبێت، بەردەوام خیتابێکی لاسەنگیان هەیە، ئەویش دەبێت بیر لەوە بکەنەوە گەنج ئەمڕۆ لە ژیانی جیهانگیریدا دەژی و لە یەك ساتەوەختدا ملیۆن زانیاریی جیاواز وەردەگرێت، گەنج چۆن پاڵفتەی بکات و بزانێت لەگەڵ کامیاندا بەرژەوەندیی هەیە و پارێزراوە لە ڕووی بەهای ئەخلاقی! ئەو گەنجە بەردەوام وا بیر دەکاتەوە لە سەردەمێکدا دەژی کە هەموو پێوەرەکان لەسەر بنەمای خۆیان ماون.

گەنج لە دنیای جیهانگیریدا کەوتووەتە ناو دەریایەك و شەپۆلەکان دەیبات و مەلەش نازانێت، پەلکێشی دەکات و نازانێت بۆ کوێی دەبات، نازانێت لەناو کام ئایندەدا خۆی دەبینێتەوە، نازانێت خزمەت بە کێ دەکات و چۆن ئاڕاستە دەکرێت.

ئەو کەسانەی دەیانەوێت کار لەسەر گەنج بکەن، دەبێت بزانن گەنج زۆر زۆر بەسوودە، بەڵام ئەوپەڕی وریایی و لێزانیی دەوێت، چونکە پڕ وزە و توانایە و ڕۆژانە هۆرمۆناتی گەشە دەکات و ژیریی گەشە دەکات و ئەو هەموو وزەیەی کە تێیدا هەیە؛ دەیەوێت خەرجیان بکات و بیانبەخشێتەوە، تەنانەت نووستن وخواردن و بیرۆکە و هەنگاوی جیاوازن، بۆیە وەرگرتن و قسە لەگەڵ کردنیشی جیاوازە. ئەو کلیلەی کە تۆ دەتەوێت مێشکی گەنجی پێ بکەیتەوە، جیاواز بێت و دەبێت خیتابەکەت جیاواز بێت، نابێت بە ناوی جیاوازینەکردنەوە قسە بکەیت.

## تەوەری دەیەم:

## گەنج و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان (سۆشیالمیدیا)

یەکێك لە بەرهەمە گرنگ و گشتگیرەکانی جیهانگیری بە گەنجی بەخشیوە، بریتییە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان. ئەو سۆشیالمیدیایەی کە تەواوی ژیانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە، گەورە و بچووك و منداڵ و خێزان و دەوروبەر. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بووە بە سەرچاوەی داهێنان و گەشەکردن و پێشکەوتن، بەڵام لەلای ئێمە بووە بە سەرچاوەی بەتاڵی و خووپێوەگرتن و بێئومێدی و بێزاری و کۆمەڵێك نەخۆشیی دیکەی دەروونی. بۆیە ئێمە بەردەوام دەبێت هەوڵی ئەوە بدەین گەنجان ئاڕاستە بکەین، بەو شێوەی کە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بکەن و چۆن بەکاری بهێنن. بۆیە ئەگەر تەماشای تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بکەین، وەکوو چرکەی کاتژمێری لێ هاتووە، هەموو ساتێك لەگەڵ ژیریی مرۆڤەکاندا کار دەکات، بەتایبەتیتریش لەگەڵ گەنجەکاندا هەڵسوکەوت دەکات.

بۆ ئەم مەبەستە دەمانەوێت ئێستا سەرژمێرییەك بکەین کە لەساڵی ٢٠٢٠دا پێشکەوتنی سۆشیالمیدیا و فەراهەمکردنی سۆشیالمیدیا بۆ گەنج چەندە گەشەی کردووە، هەروەها چۆن سوود لەم جۆرە بازاڕە ژمارەییە وەربگرین لە ئێستادا و گەنجی ئێمەش لە جیهانگیریدا هەنگاو بنێت. دیارە بە گوێرەی ڕاپۆرتەکانی بەشێك لە ڕێکخراوە تایبەتمەندەکانی سۆشیالمیدیا، هەروەها لە ڕاگەیاندنە کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی عەرەبی، زیاتر لە سێ ملیار و چوار سەد و هەشتا و چوار ملیۆن کەس سۆشیالمیدیا بەکار دەهێنن، لە ناویاندا سەد و سی و شەش ملیۆن کەس لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. دەتوانین بڵێین ٥٣%ی دانیشتووانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خەریکی سۆشیالمیدیان، ئەی بۆچی ئاستی خوێندن ساڵ بە ساڵ دادەبەزێت! ڕێژەی سەرکەوتن لە زانکۆکانماندا ساڵ بە ساڵ دادەبەزێت! لە هەموو جیهانی ئیسلامی بەگشتی، نەك تەنیا هەرێمی کوردستان.

لە کاتێکدا هەموو ئەو داهێنانەی لە وڵاتاندا دەکرێت ساڵانە؛ لەلای ئێمە نین، هەر لە بابەتی تەکنەلۆژی و تا دەگاتە کشتوکاڵ و تەندروستی و... هتد. کەواتە قەڵەمەکەت و دەفتەرەکەت و کامێراکەت و تەنانەت مۆبایلەکەی دەستت گەنجانی ئەورووپا و وڵاتانی دیکە وەبەریان هێناوە، واتە ئەوەی ئێمە دەیکەین، تەنیا بەکارهێنانە و وەبەرهێنان نییە و بەکاربردنە. بۆیە تێبینی دەکەین گەنجانمان ئەوەی کە لە سۆشیالمیدیاوە بەرهەمیان هێناوە، تەنیا خۆخەریککردن و بەهەدەردانی پارەیەکی زۆرە.

لە جیهاندا هەر یەکێکیان کە دروست کراوە، لە ڤایبەر و لە ماسنجەر و لە وەتسئەپ و سناپچات و تیکتۆك... هتد، بەبێ ئامانج دروست نەکراون و هەر یەکێك لەوانە ئامانجێکیان لە پشتەوەیە.

هەر هەنگاوێك ئەوان دەچنە پێشەوە، لەوە دەڕوانن ئەوان لەو هەنگاوە چییان دەست دەکەوێت. واتە کاتێك ئەوان دێن و یەکێك لەو بەشانەی سۆشیالمیدیا زیاد دەکەن، کۆمەڵێك ئامانج و مەبەستیان بەو کارەوە بەستراوەتەوە. بۆ نموونە؛ چاتیان دروست کرد، بۆ ئەوە نا کە شەوانە کچ و کوڕێك بەدیاریەوە دابنیشن عاشقایەتی بکەن، بۆ دروستکردنی پەیوەندیی نێوانیان بوو لە کڕین فرۆشتن و گەیاندن و نوێکاری، بۆ مەبەستی قازانجویستی و بۆ گەیشتن بە ئامانجی ئابووری، چونکە ئەو جۆرە پەیوەندییە (چات) ئاسانتر بوو و کاتی زۆری کورت دەکردەوە لەنێوان کۆمپانیا و سەنتەرە بازرگانییەکان، هەروەها تێچووی زۆر کەم دەکردەوە و ئاستەکەشی پارێزراو و سەلامەت بوو. گەنجانیش توانییان لە ڕێگەی چاتەوە گەشە بە بوارەکانی مێشك و زیرەکیی بازرگانی بدەن. پاشان ئەوانەی کە کرێکار بوون، یان ئەوانەی بازرگان بوون، توانییان بە نرخێکی زۆر کەم بتوانن بگەنە ئامانجێکی زۆر گەورە لە ڕێگەی چاتەوە و کارەکانی خۆیان لەم ڕێگەیەوە پەرە پێ بدەن.

هەنگاوی دووەم کە گەشەی کرد، بەبازاڕکردنی ڕاستەوخۆ بوو. لەو بازاڕەدا جیهان زۆر کەڵکی وەرگرت. بۆ نموونە ئەگەر بەتەنیا چین وەربگرین، زۆربەی بازرگانییەکانی لە ڕێگەی بەبازاڕکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەمەریکا و لەگەڵ

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، گەنجەکانیان هەر لە چینەوە سەرپەرشتی و کارگێڕیی کارەکان دەکەن.

بەداخەوە، لەلای ئێمە لەبریی ئەوە؛ سەدان و هەزاران گەنج لەلایەن کۆمپانیای وەهمی و ناڕاستەوە لەخشتە براون و جۆرێك کۆمپانیای بێبنچینە و بێناسنامە لەسەر گیرفانی ئەمان پەرەیان پێ دراوە و چەند کەسێك ئەو هەزاران کەسە بۆ خۆیان بەکار دەهێنن. لە ڕێگەی سۆشیالمیدیاوە پێگەیان دروست کردووە و ئەوەش بەبازاڕکردنی ڕاستەوخۆی ئەوانە.

بە پێی دوایین سەرژمێری، ٦٠%ی ئەوانەی بەکاری دەهێنن؛ ناتوانن سوودی لێ وەربگرن.

دەبینیت ئەمڕۆ وڵاتانی زلهێز هەر چی سەروەت و سامانە بۆ خۆیانیان بردووە، هەر چی دەسەڵاتی ماددی هەیە لەلای خۆیانە، هەر چی ئابووریی زەبەلاحە لەلای خۆیانە، لەبەر ئەوەی ئەوان بە عەقڵی سەرمایەداری بیر دەکەنەوە. سەروەت لەلای ئێمەیە، لە جیهانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەر چی داهاتە لەلای ئێمەیە، بەڵام ئەوان بە عەقڵ توانیویانە بە جیهانگیری هەر چی داهاتە بۆ خۆیانی ببەن و ئێمەی گەنج و ئێمەی جیهانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سوود لەم پێگە و مینبەرانە وەربگرین کە بۆ تۆی فەراهەم کردووە بۆ ئەوەی تۆ بتوانیت بەرهەمت هەبێت.

کوا بەرهەمەکانی ئێمە لە وەتسئەپ، کوا بەرهەمەکانی ئێمە لە ڤایبەر، کوا بەرهەمەکانی ئێمە لە ماسنجەر، کوا بەرهەمەکانی ئێمە لە ئینستگرام و تویتەر؟ لە وڵاتان جاری وا هەیە سەرۆکی وڵاتێکە، هەر لە ڕێگەی تویتەرەوە ڕێنمایی دەردەکات.

لە ساڵی ٢٠٢٠دا هەلی کڕین و فرۆشتن و قازانج لەگەڵ سۆشیالمیدیادا زیادی کردووە، بۆ نموونە بازاڕێکمان هەیە پێی دەڵێن بازاڕی ئەلیکترۆنی، ئەگەر لە بازرگانەکان بپرسیت دەزانیت چ خزمەتێکی بە بازرگانەکان و کۆمپانیاکان کردووە و چ خزمەتێکیشی بە کۆمەڵگایەك کردووە کە گەشەی بازرگانیی پێ

بەهێز بکات. ئێمە ئەوەمان بۆ نەکراوە و نەشمانکردووە. بۆ نموونە؛ گوگڵ یەکێکە لە بەرهەمەکانی جیهانگیری و هەموو تاکێك دەبێت بەشێك پێشکەش بە گوگڵ بکات، هەموو بەشداربوونێك پشکێك بۆ ئەوە. یان کۆمپانیای ئەپڵ، ئێستا ڕێژەی سەرمایەی گەیشتووەتە ترلیۆن، ئەمە جیهانگیری بەرهەمی هێناوە، بەڵام بە بیرۆکەیەکی سەرمایەداری.

ئێمە لێرەدا نابێت بازاڕی سەرمایەداری خۆش بکەین، چونکە لە کۆتاییدا سیستمی چینایەتیی لێ دروست دەبێت. کە سیستمی چینایەتیی لێ دروست بوو، کۆیلە بەرهەم دەهێنێت. وەك ئێستا لە وڵاتان کۆیلە زۆرە و چینایەتییش وای کردووە کە چینێك بازرگانە و سەرمایەدارە و چینێك ناوەندە و چینێکیش لە برساندا دەمرن، وەك بەشێکی زۆر لە وڵاتانی ئەفەریقی بەو جۆرەن. ئەوە جیاوازییەکی زۆر گەورەیە و بەرهەمی سەرمایەدارییە. کە دەڵێین سەرمایەداری، مەبەستمان ئەوەیە کە ئەوان بە ئامانجی سیستمی سەرمایەداری هەنگاوی تەکنەلۆژی دەنێن.

ئێمە سیستمێکی ئیسلامیی زۆر مەزنمان هەیە، چینایەتی و کۆیلایەتی وەبەر ناهێنێت، هاوسەنگیی تێدایە و هەموو تاکەکان تێیدا ئاسوودە و خاوەنی ماف دەبن، بەڵام ئێمە پشتمان تێی کردووە و بەکاری ناهێنین.

لەولاشەوە گەنج بێپەروا و بێئامانجە، لە کاتێکدا هەر چی هاتووتە بەردەستی؛ بە بەرنامەیە و بە پلان و شێوازێکی وردی کارکردنە و دەزانن بۆ کوێ و لە کوێوە کار دەکەن و دەزانن لە کۆتاییدا ئاڕاستەی جیهان بەرەو کوێ دەبەن و هەموو خەڵك چۆن دەکەن بە بەندە و کۆیلەی خۆیان. ئێستا ئاگاداریت هەموو جیهان دەبێت سەروەتێك لە سەروەتەکانی ڕادەستی ئەم کۆمپانیایە سەرمایەدارانە بکات، جا ئیتر گوگڵە یان ئەوانی ترە!

ئێمە کە قسە لەسەر ئەو بابەتانە دەکەین، دەمانەوێت گەنجی ئێمە هۆشیار بێت، کات بەفیڕۆ نەدات، بەئاسانی سامان لەکیس نەدات، چونکە لە کۆتاییدا سیستمێکی ترسناکت بۆ بەکار دەهێنێت کە خێزانەکەت هەڵدەوەشێنێتەوە، کۆمەڵگەکەت هەڵدەوەشێنێتەوە، تاکەکان لە نەگۆڕ و پرەنسیپ و بەهاکان دوور

دەخاتەوە، شوناس و ناسنامەکان بزر دەکات، ئەمە هەموو بە شەپۆلێکی سەرمایەداریی بەهێز.

ئێمە دەرگا لە خۆمان داناخەین بەرانبەر سۆشیالمیدیا، بەڵکوو دەیکەینەوە، بە مەرجێك پێوەرەکانمان دیار بێت، ئامانجمان دیار بێت، نەگۆڕەکانمان پارێزراو بن، بە مەرجێك بەهای تاك و خێزان و کۆمەڵگا و نیشتمان و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی پارێزراو بن.

بە پێی کۆتا سەرژمێریی ئەو ناوەندانە، لە سەددا هەشتا و شەشی ئافرەتان کە لە سۆشیالمیدیادا بەناوبانگن، لە سەددا حەفتای ئەوانە گەنجن، ئینجا هەمووشیان کاریگەریی سۆشیالمیدیایان لەسەرە.

ئەو سۆشیالمیدیا و ڕێگایانەی کە ئێستا هەن، چەند جۆرێك و چەند ناوێکن و بەکار هاتوون، دیارترینیان فەیسبوکە. فەیسبوك مامۆستایەکی ئەلیکترۆنیی بەهێزە، کە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر خەڵك بەوە سەرسامە. بە پێی ئەو سەرژمێرییانەی ئێستا باسی دەکەین، لە ساڵی ٢٠٢٠دا فەیسبوك ملیارێك و شەش سەد ملیۆن بەکارهێنەری هەیە ڕۆژانە. واتە بە پێی ئەوەی وەرگیراوە، لە ٥٨ خولەکدا ئەم ڕێژە زۆرە لە خەڵك فەیسبوك بەکار دەهێنێت، بەڵام چەند لە بەکارهێنانەکەی ئامانجدارە، چەند لە بەکارهێنانەکەی نەخشەڕێگای بۆ داناوە، چەند لە بەکارهێنانەکەی بە ئامانجێکی دوورمەودایە!

ئەمڕۆ گرنگییەکی یەکجار بە یوتیوب دەدرێت، ئەویش بە بەرانبەرکێیەکی زۆر بەهێز بۆ ڕاکێشانی هەموو بیرۆکەی گەنج بەلای خۆیدا دادەنرێت. سەد و چل و نۆ ملیۆن کەسی بەکارهێنەری هەیە ڕۆژانە[١]. ئینستگرام، بە پێی سەرژمێرییەکان سەد و شەست و شەش ملیار سەردانیکەری هەیە. وەك دەگوترێت بەبەردەوامی سەدا چل و پێنجی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تویتەر بەکار دەهێنن، جگە لە تیکتۆك و بابەتەکانی تر.

---

[١] بڕوانە: https://www.dimofinf.net/blog/-، إحصائيات السوشيال ميديا في ٢٠٢٠.

## تەوەری یازدەیەم:
## گەنج و هەستانەوە

گەنج و جیهانگیری دوو فەزای زۆر فراوانن. بەشێکی زۆر لە کۆمەڵگای ئێمە کاتێك لە بابەتێکی لەم شێوەیە دەڕوانن، یەکسەر پەرچەکرداری بۆ دروست دەبێت و دەڵێت گەنج لە قۆناغێك و سەردەمێك و جوگرافیایەك و ژینگەیەك و سنوورێك گەمارۆ دراوە، چۆن داهێنان بکات و لەگەڵ جیهانگیریدا گوزەر بکات!

کەسانێك کە بیانەوێت داهێنان بکەن و جێپەنجەیان دیار بێت و لە ژیاندا پەیامی خۆیان بگەیەنن، لە هەر کاتێك و لە هەر سەختییەك و لە هەر ژینگەیەك و لە هەر دۆخێکدا و لە هەر سنوورێکی جوگرافیدا بێت، بە کۆششی زۆرتر و بە هەوڵ و توانای بەردەوام کاری خۆیان دەکەن. بەڵام ئەوی تر کە جوگرافیا و ژینگەیەکی گونجاوی هەیە، ئاسانترە و هەوڵی کەمتری پێویستە کە بگاتە داهێنان. وڵاتانی ڕۆژئاوا کە ئێستا خاوەنی داهێنانن، لە کاتی نەفامی و پاشەکشە و تاریکیدا زۆر لە حاڵی ئێستای ئێمە خراپتر و دواکەوتووتر بوون، دواتر هەر بۆخۆیان بە هەوڵدان بەربەستەکانیان شکاند و گەیشتنە ئەم قۆناغە. خۆ ئەگەر ئاورێك لە سەردەمی زێڕینی ئیسلام و موسوڵمانان بدەینەوە، ئەویش بە هەمان شێوە لەپێش هاتنی ئیسلام حاڵی نیمچەدوورگەی عەرەب زۆر لە حاڵی ئێستای ئێمە خراپتر بوو، دواتر بە هەوڵ و شەونخونی و بەرخودان داهێنانیان دروست کرد.

تەوەرەکەمان بریتییە لە گەنج و هەستانەوە، ئینجا هەستانەوە لە بواری زانست، فیکر، فەلسەفە، ئەدەب، ئینتیمای نیشتمانی بێت، یان لە بواری شارستانی، ئاوەدانکردنەوە و گەشەی ئەندازەیی بێت، هەر یەکێك لەمانە دەرفەتێکی گەورەی بۆ گەنج ڕەخساندووە.

## یوسف (سەلامی خوای لەسەر) و داهێنانی ئابووری

تەماشای بەسەرهاتی یوسف بکەین (سەلامی خوای لەسەر)، داهێنان دەکات لە کاتێکدا گەنجە. جیهانێکی جیهانگیری هەیە، چونکە ئەو دەوڵەتە کە دەوڵەتی میسرە، بە واتای وشە جیهانگیرە و ئەویش خێزانی پاشایە و دەبێتە دەروازەی شەهوەت، بەڵام وەك قورئان دەفەرموویێت: ﴿وَرَاوَدَتْهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحْسَنَ مَثْوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾﴾ (یوسف: ٢٣).

چونکە یوسف (سەلامی خوای لەسەر) پەیامێکی پێیە، دارای نوێنەرایەتییەکە و ناهێڵێت شەهوەت ڕێگەی لێ بگرێت لەوەی پەیامەکەی بگەیەنێت. بۆیە بە پەیامەکەی لە دنیای جیهانگیریی سەردەمی خۆی کە پەیامێکی ئابوورییە، دەوڵەت و وڵات و گەلێك ڕزگار دەکات.

﴿قَالَ ٱجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾﴾ (یوسف: ٥٥)

گەنجێك دەڵێت من پڕۆژەیەکم پێیە و بمکەنە وەزیری دارایی. ئەی گەنج، تۆش وەرە پڕۆژە پێشکەش بکە، پڕۆژەیەکی ئابووری، پڕۆژەیەکی ئەندازیاری و کیمیایی و شارستانی بۆ ئەم کوردستانە، بۆ ئەم هەرێمە. دەزانم دەڵێیت ڕێگریم هەیە، بەڵێ، ئەوانەی باسیان دەکەین هەموویان ڕێگرییان لێ کراوە، بەڵام ئەو ڕێگری و بەربەستانەیان لا داوە و ملی بە ئاڵنگارییەکانەوە ناوە و هەوڵی داوە هەستێتەوە.

## گەنجانی کەهف و داهێنانی ڕووبەڕووبوونەوەی ستەم

یەکێك لەو داهێنانانەی کە گرنگە لە چوارچێوەی بەرنامەی گەنج و هەستانەوە، ئەوەیە کە تۆ ڕووبەڕووی ستەم ببیتەوە. گەنج نابێت بە ستەم ڕازی بێت؛ ستەمی تاکەکەسی، ستەمی کۆمەڵگا، ستەمی دەسەڵات...

قورئان دیسان نموونەیەکی دیکەمان پێ دەدات لە بارەی ئەو گەنجانەی کە توانیویانە ڕووبەڕووی ستەمکاران ببنەوە، دەفەرموویێت: ﴿نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ١٣﴾ (الكهف: ١٣).

چونکە ئەوانە گەنج بوون و نیازیان هەستانەوە و نیەتیان گۆڕانکاری لە سیستم و لادانی ستەم و گەشەی کۆمەڵگا بوو، چییان کرد!

﴿وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ١٤﴾ (الكهف: ١٤).

گرنگە تۆ ڕووبەڕووی ستەم ببیتەوە، واتە بەوە دەتوانیت هەستیتەوە.

## گەنجانی دەوری پێغەمبەر و داهێنان

لە مێژووی ئیسلامدا گەنج هێندە تێیدا گەشەی کردووە و بەرەوپێش چووە، لە مێژووی هەموو مرۆڤایەتیدا هێندە ڕۆڵی پێ نەدراوە. کاتێك تەماشای پێغەمبەر دەکەین (دروودی خوای لەسەر)، ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلیی کوڕی ئەبوتاڵیب هەن، لەوێدا زەید دەکات بە بەرپرسی سوپا! زەید گەنجێك بوو، جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب گەنجێك بوو، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە گەنجێك بوو، خالیدی

کوڕی وەلید گەنجێك بوو، هەموویان سەرکردە و سەرپەرشتی سوپایەك بوون دژ بە ڕۆمەکان. لە ڕۆژگارێکی وا سەختدا، ئەم گەنجانە سەرکردە و پێشەنگ بوون، چونکە سەرکردە لە ناواخنی پرۆسەدا دروست دەبێت، سەرکردە لە هەڵسوکەوتی ژیان و بوونی لەناو دۆخەکەدا دروست دەبێت، ئەمانە گەنج بوون و توانییان گەورەترین هەستانەوە دروست بکەن.

ده مژدەپێدراوەکە هەن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) گەنجێك دەهێنێت و دەیکاتە سەرپەرشتی غەزوویەکی بەهێز، ئەویش ئوسامەی کوڕی زەیدە، کە بە ڕای زۆربەی مێژوونووسەکان تەمەنی هەژدە ساڵ بووە. واتە بە هەژدە ساڵی توانیی ببێتە سەرکردە و پێشەنگ و لە جیهانگیریی ئەو سەردەمەدا بتوانێت ڕۆڵ ببینێت و هەنگاو بنێت و بەرەوپێش بچێت و سەرپەرشتیی ئەو پیاوە مەزنانە بکات کە لەدوای بڕۆن و بەگوێی بکەن.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: "إِنَّ اللهَ يَعْجَبُ مِنْ شَابٍ لَيْسَ لَهُ صَبْوة"، واتە: "خودای گەورە سەرسامیی خۆی بە گەنجێك دەردەبڕێت کە ڕاوەستاوە و نەکەوتووە". ئەم بابەتەمان هەڵبژارد، بۆ ئەوەی گەنجی هەرێم و وڵاتی خۆمان بێئومێد نەبن و ئەوە مێژووی ئێمەیە.

## گەنج و هەستانەوەی ئوممەت

گەنجان چۆن تونیویانە بینای ئوممەت دروست بکەن، واتە چۆن ئوممەتێك کە پێی دەگوترێت ئوممەتی ئیسلامی و گەنج توانیویەتی تێیدا هەبێت و زانست و ڕۆشنبیری پەخش بکات و تێیدا لە لوتکەدا بێت!

باسی کۆمەڵێك گەنج دەکەین کە جێپەنجەیان لەسەر ژیان داناوە و ئەو شوێنەوارەش بۆ سەردەم و سەدەیەك نەبووە، بەڵکوو سیازدە سەدە درێژەی کێشاوە.

### زوبەیری کوڕی عەوام

یەکێکە لە دە مژدەپێدراوەکە، تەمەنی پازدە ساڵ بوو بەشداریی لە بینای ئوممەت کرد. ئەم بینایەی کە دەوڵەتی پێك هێنا و هاوڵاتیبوون و ئاوەدانی و شارستانی و ئازادیی کردە بنەما، ئەو دەوڵەتەی کە ستەمی نەهێشت، لەسەر شانی زوبەیری کوڕی عەوام دروست بوو.

### تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا

یەکێکە لە دەمژدەپێدراوەکە، شازدە ساڵان بوو.

### سەعدی ئەبووەقاس

خاڵی پێغەمبەر بوو، تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو.

### ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم

گەنجێکە و تەمەنی شازدە ساڵانە و لە بەنیمەغزومە و ماڵەکەی خۆی دەکات بە جێگەی پێگەیاندنی سەرکردە و گەشەپێدانی مرۆیی.

ئەم دۆخە وای کرد کە سیازدە سەدە ئەو کۆمەڵە گەنجە ژیان بۆ مرۆڤایەتی بگێڕنەوە، توانییان ئازادی فەراهەم بکەن و هاوڵاتیبوون بکەن بە بنەما. نەك موسوڵمان، جگە لە موسوڵمانیش بێت و لەم دەوڵەتەدا بە عەقڵ و توانا و فیکر ژیان پێشکەش بکات. ئەوانەی دەوڵەتی مەدینەیان دروست کرد، ٤٠ کەس بوون کە ٣٦ کەسیان گەنج بوون.

## ئەگەر بێینە سەر مەیدانی زانست، کەسانێکی وەکوو چوار پێشەوا بەڕێزەکە

### ئیمامی شافعی

شافیعی لە گەنجێتیدا دەستی بە لەبەرکردنی قورئان و بەشێك لە زانستی شەرعی کردووە، بەڵام کە تەمەنی دەگاتە پازدە ساڵ، هەندێکیان دەڵێن دوانزدە ساڵ، وەکوو موفتییەك دادەنیشێت و فەتوا دەدات. یاسای تێگەیشتنی فیقهـ دادەنێت بە ناوی "اصول الفقه"، کە هەتا دنیا ماوە ئەم داهێنانە هەموو فیقهییەک و یاساناسێك پێویستی پێیەتی و بۆی دەگەڕێتەوە.

ئەمە پێمان دەڵێت ئەی گەنج، لە دنیای جیهانگیریدا بڕوات بە زانست و ڕۆشنبیرییەکەی خۆت بێت، بە هەر بابەتێکی تەکنەلۆژی و ڕاگەیاندنکاری تۆ بتوانیت لەوێوە خزمەت بکەیت و جێدەستت دیار بێت، ئەوا داهێنانێکی گەورەت کردووە و نەکەیت سارد ببیتەوە.

### ئیمامی بوخاری

کارێکی زۆر ناوازەی کردووە پاش قورئانی پیرۆز، کە ئێستا ملیارێك و حەوت سەد ملیۆن موسوڵمان هەیە، هەموویان لەپاش قورئان دەگەڕێنەوە سەر ئەو کتێبەی کە ئەو پێشەوایە پێوەی خەریك بووە و کۆی کردووەتەوە و ئامادەی کردووە. ئەو کاتە گەنجێك بووە، داهێنانی لە کۆکردنەوەی فەرموودەدا کردووە، ئەم داهێنانە لە هیچ سەردەم و زەمانێکدا پشتگوێ ناخرێت و کۆن نابێت.

### ئیبن تەیمیە

ئەگەر لە مەیدانی فیکردا لە گەنج بڕوانین، بێگومان ئەمڕۆ ململانێ و بگرەوبەردەیەکی زۆر ڕووبەڕووی هزری گەنج بووەتەوە، هەر لە داروین و مارکسەوە تا نیچە و مەیدانی ئەمڕۆی ئەورووپا و مەسەلەی عەلمانیەت و ماسۆنیەت. یەك

پاڵەوانمان هەیە و ناوی ئیبن تەیمیەیە و توانیویەتی لە یەك كاتدا وەڵامی هەموو ئەو گومانە بداتەوە. وەك تۆ گەنج بووە، بەڵام ئەو لێبڕاوانە هەنگاوی جددیی ناوە و هەروەها پەرەپێدانی بەردەوامی لە ژیانی فیكریدا كردووە.

ئێستاش بۆ وەستانەوە بە ڕووی ئەو جۆرە شەپۆلە نامۆ و ناجۆرانەدا كە ڕووبەڕووی یەخەی جیهانی موسوڵمانان و هەموو دنیا دەبێتەوە، هەر دەبێت پەنا بۆ كتێبەكانی ئەو ببرێت و كەڵكیان لێ وەربگیردرێت. ئەم پێگە و مەزنییە، لەبەر ئەوەی بڕوای بە داهێنانی فیكری هەبووە و ئەو كاتە جیهانگیرییەك هەبووە، بەڵام لە چوارچێوەی دەوڵەتێكی گەورەدا كە پێی گوتراوە "دار الإسلام" و لەوێ توانیویەتی خزمەتی گەورە بكات.

### عیزی كوڕی عەبدولسەلام

عیزی كوڕی عەبدولسەلام بە یەكێ لە داهێنانەكانی توانیویەتی ڕووبەڕووی ستەمێكی گەورە ببێتەوە. "قواعد الاحكام"ی داناوە، یاسای ژیانە، هەزاران شەرحی لەسەرە، دەڵێی بۆ ئەمڕۆ دانراوە و كۆن نەبووە.
گەنج بووە و بووە بە سوڵتانی زانایان، پێشەنگ بووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمكار و داپڵۆسێنەران، چونكە مرۆڤ واتە ئازادی، خوایەكی مەزن زۆر لە گەنجێك ناكات تا بەزۆر موسوڵمان بیت، پێی دەفەرموێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦﴾ (البقرة: ٢٥٦)، بەڵام كاتێك مرۆڤێك دێت ستەمت لێ دەكات، قۆرخكاری دەكات و ئازادیت لێ بەرتەسك دەكاتەوە، ئیدی ژیانی مرۆڤەكان تێك دەچێت.

ئازادی واتە شكۆمەندی و شوناس و مرۆڤایەتی، ئەگەر ئازادی نەبوو؛ بوونیش نابێت، عیزی كوڕی عەبدولسەلام گەنجێكە و دەرگای ئازادی دەكاتەوە و دەرگای ستەم بە ڕووی خەڵكدا دادەخات.

بەو شێوەیە تەماشای ئەو کەسانە بکەین کە گەنج بوون و توانیویانە ئەو ئازادییە بگەیەننە هەموو لایەك، تۆش لە ئەمڕۆی دنیای جیهانگیریدا و لێرە بەشدار بە، لە دنیای جیهاگیریدا ستەم کراوە و ئازادی قۆرخ کراوە و گرفتگەلێکی زۆر هاتووەتە سەر ڕێگەمان، بۆیە نەکەیت لەم بابەتە سارد ببیتەوە.

## محەممەدی کوڕی قاسمی سەقەفی

محەمەدی کوڕی قاسمی سەقەفی پێی دەڵێن دامەزرێنەری یەکەم وڵاتی موسوڵمانان لە هیند، واتە دەوڵەتێکی لە هیند دروست کرد و ئێستا بە ملیۆنان موسوڵمان لەو وڵاتە هەن.

با ئێمەش لە خۆمان بڕوانین، ببینین لە ژیانماندا چیمان کردووە، یان گەنجێك خۆی بەراورد بکات ئایا چیی کردووە و چیی پێ دەکرێت!

## تاریقی کوڕی زیاد

تاریقی کوڕی زیاد گەنجێك بوو دەرگای ڕۆژئاوای کردەوە، جێیەکی تا ئێستاش بەناو کراوە، بە ناوی جەبەل تاریقەوە.

## عەبدولڕەحمان ناسر

عەبدولڕەحمان ناسر یەکێکە لەوانەی کە پێی دەڵێن بەهێزترین پاشای ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. عەبدولڕەحمان ناسر لە تەمەنی بیست و دووساڵیدا توانیویەتی دەوڵەتێك لە ئەورووپا دروست بکات. کەواتە لەبیری نەکەیت ئەو زانست و ڕۆشنبیری و فەرهەنگ و ئەدەبیاتەی کە ئێستا لە ئەورووپا هەیە، بە دەستی گەنجێکەوە چووەتە ئەوێ بە ناوی عەبدولڕەحمان ناسر.

### ئیبن ئەبوعامر

محەمەد ئیبن ئەبوعامر لە دێیەك بەرەو ئەندەلووس دەڕوات و وڵاتێك بینا دەكات. سەرپەرشتیی ٥٦ جەنگی كردووە، لە هەر هەمووشی سەركەوتوو بووە.

### با بەراوردكارییەكی كورت بكەین لەم كۆمەڵە قسەیەی پێشوو لێی دواین

گەنجی ئەورووپی كەڵكی زۆری لە مێژووی موسوڵمانان وەرگرتووە و دەستی بە سێ بنەمای سەرەكییەوە گرتووە:

### یەكەم: نەبوونی شەڕ و ئاژاوە لە ڕۆژئاوا

لەناو خۆیاندا بە هیچ شێوەیەك شەڕ و ئاژاوە دروست ناكەن، ئەمە لە ئیسلامەوە فێر بوون، كەچی موسوڵمانان ئێستا هەموو خەریكی شەڕن دژی یەك.

### دووەم: بنەمای هاوڵاتیبوون

گەنجان وڵاتێكیان فەراهەم كردووە كە پێی دەڵێن وڵاتی هاوڵاتیبوون، كە ئەمە بنەمایەكی گرنگی وڵاتی ئەورووپییە، واتە هەموو تاكێك بۆی هەیە بژی و دادپەروەری بیگرێتەوە و نابێت ستەمی لێ بكرێت و هەموو گەنجێك دەتوانێت داهێنان بكات و لە دامەزراوەی مەدەنی و وڵاتدا جێی ببێتەوە... هتد. چەندان گەنج لێرە هەڵهاتوون لە ستەم و لەوێ گەورەترین ڕۆڵیان بینیوە و خزمەتیان كردووە، لە زانكۆ گەورەكان خوێندوویانە و گەورەترین دڵسۆزییان نواندووە و جێدەستیان دیارە و ئاماژەیان بۆ دەكرێت. لە كاتێكدا سەردەمانی زوو وڵاتی ئیسلام سەرچاوەی دەستخستنی زانست و سەرچاوەی بنەما گرنگەكانی ئێستای وڵاتانی ئەورووپییە. گەنجەكانی ئێمە وەكوو ئیبن سینا و فارابی، سەرمەشقی سەرچاوە زانستییەكانی ئەوانن. ئێستا ئێمە دەستمان داوەتە یەخەی یەك و گێرەوكێشە و لەلای ئەوانیش سەقامگیری و ئاوەدانی و پێكەوەهەڵكردن.

جیهانگیری ئەو دەروازەیەیە گەنج چاوی بكرێتەوە و بەرەوپێش بڕوات و گرفتەكانی پێشی تەخت بكات و بەربەستەكان لا بدات و متمانەی بە خۆی بێت. داهێنان و سەلماندنی خود و تامكردن لە دنیای گەنج ئەوەیە، لە دۆخی شپرزی و

ئاژاوەگێڕیدا داهێنان بکرێت، لە دنیای پاشەکشەدا ئەو پێش بکەوێت، لە دنیای ڕق و دواکەوتن ئەو هەستێتەوە، لە دنیای ستەمکاری ئەو ئازادی و ژیان بهێنێتە بوون.

ئەگەر گەنج هەست بە بەرپرسیاریەتی بکات و هەست بە دەرگایەك بكات كە دەیەوێت بیكاتەوە، ئەوە سەركەوتووە و داهێنانی كردووە. ئەوانەم باس كرد، تا بزانیت تۆ دەتوانیت لەم دۆخە شێواوەدا بجووڵێیت و بنەمای فیكری و زانیاری و ڕۆشنبیری و تا دەگاتە ژینگە، بە دەستی تۆی گەنج بینا بكرێت و بچەسپێنرێت.

**سێیەم: بنەمای دادپەروەری**

سێ سەدە ڕۆژئاوا لەناو گێژاوی ستەمی كڵێسە و پیاوانی ئاییندا دەژیا، هەموو سێكتەرەكانی ژیان پڕ بووبوون لە ستەم و نادادی، ئەمە وای كردبوو هیچ پێشكەوتن و داهێنانێك نەكرێت، دوای شۆڕشی فەڕەنسی سوودیان لە دادپەروەریی ئیسلام و موسوڵمانان بینی و زانییان دادپەروەری بنەمای پێشكەوتنە بۆ هەر گەلێك كە دەستی پێوە بگریت. ئەم بنەمایە ئێستا لە ڕۆژئاوا بەركارە و بۆ ناوخۆیان كاری پێ دەكەن، بووەتە هۆكار بۆ درێژەپێدانی ژیان و شارستانیەت و داهێنان.

## تەوەری دوازدەیەم:
## كۆمەڵێك ئامۆژگاری بۆ گەنجانی سەردەمی جیهانگیری

خۆشترین كاتەكانم لە قۆناغەكانی ژیانمدا گوزەرم كردبێت، ساڵەكانی زانكۆم یان لە مزگەوت، یان لە دامودەزگاكانی ڕێكخراوەكانی مەدەنی لەگەڵ گەنجاندا هەنگاوم ناوە و ئاسوودەترین و بەختەوەرترین كاتی ژیانم بووە كە لە خزمەتی گەنجان و هەرزەكارانی خۆشەویست، لە خزمەت گەنجانی داهێنەر و ژیردا بووم، ئەمە فەزڵێكە لەبیر ناكرێت. كاتێك دەڵێین گەنج، هەم كوڕی گەنج كە برامانن، هەم كچی گەنج كە خوشكمانن؛ دەگرێتەوە. كۆتا تەوەرم بۆ كۆمەڵێك ئامۆژگاری بۆ گەنجان لە دنیای جیهانگیری تەرخان كردووە.

# ئامۆژگارییەکان

## ئامۆژگاریی یەکەم: ڕازینەبوون بە دواکەوتوویی و پاشەکشە

نابێت گەنج بە دواکەوتوویی و پاشەکشە ڕازی بێت، لە دنیای پێشکەوتن و پەرەپێدان و داهێنانی بەردەوامدایین، ئەگەر یەك چرکە وەك خۆت بیت، بێگومان دوا دەکەویت. پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر) پێش ١٤٠٠ ساڵ پێمان دەڵێت نابێت ئەمڕۆت وەکوو دوێنێت وا بێت، واتە ئەمڕۆت دەبێت لە دوێنێ باشتر و پێشکەوتووتر بێت. کارکردنی گەنج لەسەر پێشکەوتنی عەقڵ و توانا و داهێنانەکانی کاری یەکەمیەتی، گرنگیدان بە گەشەی کۆمەڵایەتی و تەکنەلۆژی و دارایی و ئابووری زۆر پێویستە.

## ئامۆژگاریی دووەم: گرنگیدان بە زانست

زانست گەورەترین چەکە ئەمڕۆ گەنج گرنگیی پێ بدات. دنیا لە ململانێی سەربازی و جەنگی جیهانیی یەکەم و جەنگی جیهانیی دووەم، دواتریش جەنگی ساردی هەردوو بلۆکی سۆڤیەت و ئەمەریکا گەیشتە دەرئەنجامی ئەوەی جەنگ ناتوانێت کەس زاڵ بکات و چارەسەری بنەڕەتی کەس ناکات و پەرەپێدان و ئاوەدانکردنەوە و شارستانی ناهێنێت.

هەنگاوی یەکەمی بەجێ هێشت کە سەربازی بوو، لە هەنگاوی دووەم جەنگ و ململانێی ئابووریی کرد، لە شەڕی ئابووریدا ململانێی یەکترییان کرد و هیچ یەکیان خۆی بۆ ئەوی تر بەدەستەوە نەدا.

ئەی گەنج، ئەمڕۆ ململانێکە گۆڕاوە و بووەتە ململانێی زانست و زانیاری و پەخشکردنی لە ڕێی ڕاگەیاندن و سۆشیالمیدیاوە. کەواتە ئێستا جیهان وڵاتێکی زەبەلاحە و بیەوێت دەست بەسەر جیهانێکی تردا بگرێت، لە ڕێی تەکنەلۆژیاوە، لە ڕێی زانست و زانیارییەوە وا دەکات.

چین کە ململانێی ئـەمەریکا دەکات، نـەهاتووە بڵێت مـن سـوپاکەم ملیـۆن و شـەش سـەد هـەزار کەسـە و بـەوە بەسـەرتدا زاڵ دەبـم، بـەڵکوو لـە بـواری زانسـت و زانیـاری و تەکنـەلۆژییەوە هـاتووە ململانێـی ئـەمەریکا دەکـات و ئـەو وڵاتـەی هەژاندووە.

**ئامۆژگاریی سێیەم: گرنگیدان بە زانیاریی تەکنەلۆژی**

پەرەپێدانی بەردەوامی زانیاریی تەکنەلۆژی. پێویستە گەنج زانست و زانیارییـەکی تەکنەلۆژی یان فیزیایی، کۆمپیوتـەری، ئەندازیاری، پزیشـکیی هەیـە، پـەرەی پـێ بدات.

ڕامەوەستە لەسەر خاڵێك وەك کۆتایی، چونکە بەجێ دەمێنیت. دەوڵـەت هـەبوون کە ململانێیان بە جەنگ لەگـەڵ یـەك کردووە نەگەیشـتوونەتە هیـچ، بـەڵام ئـەمڕۆ بە زانست و زانیاری پێشی کەوتووە. ئامۆژگاریی بنـەڕەتیم بۆ تـۆی گـەنج ئەوەیـە کە بەردەوام بە لە پەرەپێدانی زانست و زانیـاریی خـۆت. چەنـدە زانسـت و زانیارییـت زۆر بێت، ئەوەندە دەتوانیت جێپەنجەی خۆت لە دنیای جیهانگیریدا بچەسپێنیت.

**ئامۆژگاریی چوارەم: هۆشیاری**

هۆشیار و ژیر بە. ئەی گەنج، ئاگات لێ بێت زانست بەبێ هۆشیاری ناتوانێت هەنگاو بنێت، بۆیە هۆشیار بە!

دۆخی خۆت گەشە پێ بدە، مەڵێ چ پەیوەندیم بە دنیاوەیە و ئـەورووپا و ئاسـیا و ئـەفەریقا و ئـەمەریکا کـەی کـاری منـە، نـەخێر، دنیـا بووەتـە گونـدێك، دەبێـت ڕۆژانە زانیاریی خۆت گەشە پێ بدەیت، تـاوەکوو هۆشـاریت هـەبێت. هۆشـیار بیـت لە دنیای ئەمڕۆ چی دەگوزەرێت، هۆشـیار بیـت لـە دنیـای ئـەمڕۆ کێ براوەیـە و کێ دۆڕاوە، هۆشیار بیت لە دنیای ئەمڕۆ دەوڵەتان کە ئازادییـان فەراهـەم کردووە؛ بـە چی گەیشـتوونەتە سـەربەخۆیی نیشـتمانی، بـە چـی گەیشـتوونەتە ئینتیمـای نیشـتمانی، بـە چـی گەیشـتوونەتە دەسـتپاکی، بـە چـی گەیشـتوونەتە بینـای

ژینگەیەکی ئارام و بەختەوەر و خۆش! کاتێك کەسانێك سەردانی ئەورووپا دەکەن، کە دەگەڕێنەوە سەرسامن بە جوانیی ئەو وڵاتە، سەرسامن بە یاسای ئەو وڵاتە، سەرسامن بە ژینگەی ئەو وڵاتە، سەرسامن بە هاوڵاتیبوون لەو وڵاتە، سەرسامن بە مافی هاوڵاتیبوون لەو وڵاتە، سەرسامن بە مافی نەخۆشێك، بە مافی بەساڵاچوویەك کە چۆن گرنگییان پێ دەدرێت. دوای زانست و زانیاری، بینای هۆشیاری لە ڕووی گرنگییەوە دێتە پێشەوە.

**ئامۆژگاریی پێنجەم: هیممەتبەرزی**

گرفتی ئێمە ئەوەیە زۆر جار دەڵێیت ئەو بەرنامەیە زۆر باشە بۆ گەنجان، بەڵام بەڕاستی خەڵك تاقەتی ئەوەی نییە، ئەمە کارەساتە! ئەگەر گەنج تاقەتی نەبێت، ئەی کێ بینای دەوڵەت بکات! ئەگەر گەنج تاقەتی نەبێت، کێ داهێنان بکات! ئەگەر گەنج تاقەتی نەبێت، کێ زانکۆکان بەرەوپێش ببات! ئەگەر گەنج تاقەتی نەبێت، کێ پیشەسازی و کشتوکاڵ و بوارەکانی ژیان بەرەوپێش ببات! کێ شارستانیەت دروست بکات! کێ زانست ببەخشێتەوە! کێ دانایی ببەخشێتەوە! هەمووی گەنج، چونکە گەنج زۆرترین تەمەنی ژیانی مرۆڤەکانە، نەڵێیت تاقەتم نییە، دەبێت خاوەنی ورەبەرزی و هیممەتبەرزی بیت.

بە هیچ شتێك مەڵێ ناکرێت، مادام لە توانای تۆدایە، دڵنیا بە دەکرێت، بەڵام بە ورەی بەرزەوە، بە ژیرییەکی پۆڵایین (**مَنْ جَدَّ وَجَدَ**). ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾﴾ (آل عمران: ١٥٩)، خوا نافەرموویت پشت بە من ببەستە، ئەوجا عەزم جەزم بکە، نەخێر، کە عەزمت جەزم کرد، ئینجا، واتە کە بڕیارت دا و هیممەتت بەرز بوو، ئەوجا پشت بە خوا ببەستە و دەست پێ بکە. کەواتە نەڵێیت بەڕاستی قورس بوو، نا، شتێك لە ژیان قورس نییە، ئەگەر کەسەکان خاوەنی بڕیار بن، خاوەنی ورەبەرزی بن. بۆیە ئامۆژگاریم بۆ تۆی بەڕێز ئەوەیە کە هیممەتبەرز بیت و ورەت بەرز بێت، بە کەمتر لەوەی کە ئامانجت هەیە ڕازی نەبیت.

**ئامۆژگاریی شەشەم: دوورکەوتنەوە لە لاساییکردنەوە**

لاساییکردنەوە خاڵێکی زۆر ترسناکە. گەنج خۆی بەدوور بگرێت لە لاساییکردنەوە و ئەم چاولێکەرییە کوێرانەیەی کە لە بوارە خراپەکاندا هەیە. بۆ نموونە ئەورووپا کۆمەڵێك کولتووری خراپی هەیە، گەنجەکانی خناوکەیەکی لەملدایە، گوێی کون کردووە، کۆمەڵێك ژیان لەگەڵ پشیلە بەسەر دەبات، ژیان لەگەڵ سەگ بەسەر دەبات، چاولێکەرییان لەمانەدا ژیریت دادەخات. یان خەریکی ماددەی بێهۆشکەر و ئەو بابەتانەیە، گەنج دەبێت لەوە دوور بکەوێتەوە، ئەگەرنا هەر گەنجێك بچێتە ناو چاولێکەرییەوە، لە ژیاندا شکست دەخوات، چونکە گەنجی سەرکەوتوو خاوەنی بیرۆکە و خاوەنی داهێنانی خۆیەتی، خاوەن دنیابینیی خۆیەتی، واتە دیدی هەیە.

چاولێکەریی کەسێك بکە کە فەیسبوکی دروست کردووە، چاولێکەریی کەسێك بکە کە دامەزراوەیەکی تۆکمەی بەهێزی داناوە و پەرەی پێ دەدات، چاولێکەریی ئەو گەنجە بکە کە باسی خۆی دەکات و دەڵێت بۆ وڵاتێك چووم، ڕوانیم بزانم بە چی پێش کەوتووە، یەك لەوانە بە دروستکردنی بەرهەمهێنەری وزە، دەڵێت لەوێ مامەوە و بۆ ماوەی دوو ساڵ، جار هەبووە ڕۆژانە یەك ژەمم خواردووە، بەڵام داهێنانم کرد و خزمەتم پێشکەشی وڵاتەکەی خۆم کرد. بۆیە گرنگە چاولێکەری نەکەیت، بەڵکوو خاوەنی فیکری خۆت بیت.

**ئامۆژگاریی حەوتەم: دوورکەوتنەوە لە بیرۆکەی ڕووخێنەر**

لە بیرۆکەی ڕووخێنەر دوور بکەوە. ئەمڕۆ دنیا لە فیکری جیاواز جمەی دێت، ئاڕاستە فیکرییەکان خەریکە سەر لە گەنجان بشێوێنن، گەنجان بە ئاقارێکدا ببەن نەزانێت لە کوێوە هاتووە و بۆچی هاتووە و دەچێتەوە کوێ. زۆر گرنگە ئەم سێ پرسیارە بزانیت و سێ وەڵامی ڕاست و دروستیشت دەست بکەوێت. ئەگەر نەتوانیت وەڵامی ئەم سێ پرسیارە فەلسەفییە بدەیتەوە، کەسێکی سەرگەردانیت.

لە فیکرەی تێکشکێنەر و بیروباوەڕی ڕووخێنەر دوور بکەوە، بیرۆکەی هەمەجۆری ڕووخێنەر لە جیهانی ئیسلامیدا بەسەر گەنجەکانماندا هاتووە، بۆیە گەنجەکانمان سەرگەردانن و نازانن بۆ کوێ بڕۆن و چۆن هەنگاو بنێن و چی دەکەن و دەچنەوە کوێ. خۆت لەم بیرۆکانە دوور بخەوە، چونکە ئەم بیرۆکانە واقیعی نین، بەڵکوو شڵەژانێکن.

هەوڵ بدە هەستی خۆت یان ناخی خۆت بگەیەنە، هەموو مرۆڤێك کۆمەڵێك ئامانج و هەست لە ژیانیدا هەیە، هیی وا هەیە لە تەمەنی منداڵی و هەرزەکاریدا زۆر لەگەڵ شیعر و پەخشان دێتەوە، جا ئەی گەنج ئەوە پەرە پێ بدە.

ئێستا لەلای ئێمە گرفتێك دروست بووە، ئەویش ئەوەیە گەنج گرنگیپێدانی بۆ خوشکی و برای و دایکی و باوکی نییە، لەوانەیە بڵێیت ئەمە چ پەیوەندییەکی بە جیهانگیرییەوە هەیە، دەڵێین بەڵێ هەیەتی، چونکە ئەوە جیهانگیرییە کوڕ و کچ کە گەنجن؛ دەیانهێنێتە دەرەوە و لە خێزانەکەی خۆی و لە کەسە نزیکەکانی خۆی و لە دەوروبەری خۆی دووریان دەخاتەوە، ناهێڵێت کەڵکی بۆ نزیکەکانی خۆی هەبێت. گەنج دەبێت سوودی زیاتری بۆ دەوروبەری خۆی ببێت، بەتایبەت دایك و باوك و خوشك و برا.

گەنج هەیە باوکی و دایکی بەدەستییەوە دەناڵێنن، ئەمە جیهانگیری کردوویەتی بە کوڕی دنیا، تۆ هەوڵ بدە کوڕی ماڵێ بە و کوڕی جیهانگیرییش بە.

**ئامۆژگاریی هەشتەم: بەردەوام بە لە ئەزموون و لە چەندبارەکردنەوە**

بۆ نموونە تۆ هەوڵ بدە هەنگاوێك لە ئەزموونێکدا بهاوە، لەو ئەزموونەدا شکستت هێنا؛ هەنگاوێکی دی بنێوە. گوتراوە ئەدیسۆن کاتی خۆی کارەبای دروست کرد هەزار هەنگاوی نا، لەم هەزارە یەك هەنگاوی سەر کەوت، ئەویش ئەو کارەبایەیە کە لەبەری حەساوینەتەوە.

ئەی گەنج، بەردەوام بە لە ئەزموونی دووبارە، واتە جارێك شتێکت ئەزموون کرد و شکستت هێنا، بەجێی مەهێڵە. مادام مادام ئامانجتە و مادام ڕەغبەتت لێی

هەیە، بەردەوام بە. بەردەوام بە لە ئەزموونکردن، لە هەوڵدان، لە دووبارەکردنەوەی پرۆسەکان، بێتاقەت مەبە!

### ئامۆژگاریی نۆیەم: گرنگیدان بە وەرزش

ئەورووپا ئێستا وەرزشی کردووەتە کولتوور، لە گەنجێتیدا خەریکی وەرزشن، دوایش کە دەچێتە تەمەنەوە هەر بەردەوام دەبێت، بەڵام چونکە جیهانی ئێمە گرنگی بە جەستە نادات، بەردەوام نەخۆشین و هەریەکە زەرفێك حەپی پێیە و هەریەکێك کۆمەڵێك نەخۆشی لە خۆی کۆ کردووەتەوە و هۆکاریش ئەوەیە وەرزش ناکەین. بۆیە جیهانگیری پێت دەڵێت بەجێ دەمێنیت ئەگەر وەرزش نەکەیت. جیهانگیری وزە و توانای زیاتری دەوێت، ئەو کەسانەی وەرزش دەکەن توانای بەخشینی زیاتریان هەیە.

ئەو کەسانەی وەرزش دەکەن تەندروستییان باشە، بەخشینیان لە بواری زانست و داهێنان و زیهنیان بەهێزترە لەو کەسانەی کە نایکەن. زۆر گرنگە پشت لە وەرزش نەکەیت و بە هەر شێوازێك لە شێوازەکان کە ڕەغبەتت لەسەریەتی، بیکە.

### ئامۆژگاریی دەیەم: گرنگی بە کەسە نزیك و هاوبیرەکانت بدە

ئەو کەسانەی لە دەوروبەرتن، هاوبیرتن، زۆر کاریگەرییان لە بەرەوپێشبردنی کار و داهینانەکانت هەیە، لەگەڵ ئەوانەدا هەنگاو بنێ. بۆ نموونە کۆمەڵێك گەنج لە دەوروبەرتن، بەشێکیان بێسەرەوبەرەن، بەڵام بەشێکیان دەبینیت خاوەنی ئامانجی گەورەن و هیممەتی گەورەت پێ دەبەخشن، لەوانەوە فێر دەبیت و ئەوانیش لە تۆوە فێر دەبن، توانا لە ئەوان وەردەگریت و ئەوانیش لە تۆی وەردەگرن، زۆر گرنگە پشتگوێیان نەخەیت.

### ئامۆژگاریی یازدەیەم: کار و کردەوە تایبەتەکانی خۆت لەبیر مەکە

ئەو کار و کردەوانەی کە هیی خۆتن، لەبیریان مەکە. زۆر جار دەبینیت خۆمان بۆ خەڵکی تر لەبیر کردووە، بۆ نموونە تۆ قوتابییت، نەکەیت خوێندنی خۆت بەقوربانی خەڵکی تر بکەیت، نەخێر، ئەوە کاری تایبەتی خۆتە، دەبێت سەرەتا

ئەوانە بکەیت، پاشان بۆ ئەوانەی تر بپەڕیتەوە. بابەتی تایبەتیی خۆت فەرامۆش بکەیت، ئەمە خۆپەرستی نییە و ئەمە ئەولەویەتە، گرنگتر، دوایی گرنگ.

**ئامۆژگاریی دوازدەیەم: گەشتکردن و گەڕان**

سەفەر بکەن لەشتان ساغ دەبێت، بیروهۆش و دنیابینیتان گەشە دەکات و زیاد دەبێت. گەشت بۆ وڵاتان ژیری و دیدت فراوانتر دەکات، چالاکیی تایبەتی زیاتر دەکات، هێز و توانات زیاتر پێ دەدات.

هەنگاو دەست پێ بکە. بۆ نموونە گەنج هەیە بۆ ماوەی دە ساڵ هەندێك پلان و هەنگاو لە مێشکیدا هەیە، هەر دەڵێت ئەمڕۆ نا سبەی، ئەمە گرفتە، دەبێت لەم ساتەوە دەست بە هەنگاوی خۆت بکەیت.

ئەگەر دەتەوێت لە بواری ئەندازیاریدا داهێنان بکەیت، هەنگاوی یەکەم دەست پێ بکە. ئەگەر لە ئاوەدانکردنەوەدا دەتەوێت، ئەوا هەنگاوی یەکەم دەست پێ بکە. ئەگەر دەتەوێت لە کۆمپیوتەردا بیکەت، ئەوا هەنگاوی یەکەم دەست پێ بکە. ئەگەر نیازی خوێندنی باڵات هەیە، ڕامەوەستە و هەنگاوی بۆ بنێ.

ئەی گەنج، سبەینێیان کە هەستایت پێشینەی کارەکەت دابڕێژە، ئەمڕۆ کارت چییە و کامیان لە هەموویان لەپێشترە و نەخشەیان بۆ دابڕێژە و یەکەم و دووەم و تا دوایی ڕیزبەندییان بکە، بەو جۆرە گرنگی بە کارەکانی ژیانت دەدەیت.

گرنگی بە تەندروستیی خۆت بدە. لە خواردن و خواردنەوە، لە نووستن و هەوڵدان، گەنج چونکە وزەی زۆرە و لە گەشەکردندایە و فیکری بەهێزە، زۆر گرنگی بە تەندروستیی خۆی نادات، بەڵام تەندروستی بنەمایە.

تۆ جاران دەتتوانی لەگەڵ گوندێك و جێگەیەکی نزیکدا هەڵسوکەوت بکەیت، بەڵام ئێستا لەگەڵ هەموو دنیادا هەڵسوکەوت دەکەیت و وزە و گوڕی هەموو دنیات دەوێت، ئەوەش بە تەندروستییەکی چاك دەکرێت، کەسێك نەخۆش بێت ناتوانێت هەنگاوی داهێنان بنێت، ناتوانێت بچێتە پێش و هەستێتەوە.

خوێندنەوە و ئاگاداربوون لە ڕەوش و هەواڵی سیاسی. ئەی گەنج، ئاگات لە

ڕۆشنبیری بێت، ئاگات لە هەندێك هەواڵی تەندروستی بێت، ئەوانە هەموویان بە خەڵکی داهێنەرەوە پەیوەستن، کەسی داهێنەر کاتەکانی بە خەو و بێئاگایی تێناپەڕێت.

شوناسی ئایینداریی خۆت لەدەست نەدەیت. وڵاتێکی وەك ئەمەریکا یاخود وڵاتە ئەورووپییەکان، بنەمای ئایینەکەی خۆیان پاراستووە، ئەگەرچی ئەوان ئایینەکەیان دەستکاری کراوە. هەڵبەت ئەو ئایینە یەکەم جار خوای پەروەردگار ناردوویەتی ڕاست بووە، بەڵام دەستکاری کراوە و شێوێنراوە، ئەوان بایەخ و گرنگیی تایبەت بەو ئایینە دەستکاریکراوە دەدەن.

ئەوەی کە ئەمڕۆ گرنگی بە شوناسی خۆی نادات، موسوڵمانە بەداخەوە. گەنج نابێت پێناس و شوناس لەکیس بدات و فەرامۆشیان بکات، کەسێکی پاك بە لەگەڵ خۆت و لەگەڵ دەروبەرت و لەگەڵ خێزانەکەت، پاك بە لەگەڵ خاك و نیشتمانەکەت.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە ڕاستگۆ بە. ئەفلاتوون و سوقرات و فەیلەسووفەکانی تر فەلسەفەکانیان باتڵ نەبووە، چونکە ڕاستگۆ بوون لەگەڵ پرەنسیپەکانی خۆیان، بە هەزاران و سەدان هەزار شوێنکەوتەیان هەیە.

خاڵی کۆتایی ئەوەیە بەردەوام لە نەفسی خۆت بپرسەوە، بڵێ ئەی گەنج، بۆچی زیاترت نەکرد، بۆچی زیاتر داهێنانت نەکرد، بۆچی زیاتر نەچوویتە پێش و زیاتر خزمەتت نەکرد و زیاتر لەو تەمەنەی کە هەبوو نەتکرد.

## میسکێك پێشکەش بە گەنجی گوڵ

حەزم دەکرد هەموو توانا و وزەی خۆم لە ڕێی خزمەتکردنی گەنجان خەرج بکەم، تا بە چاوی خۆم بەرهەمی گەنجانی وڵاتەکەم ببینم لە خزمەتی ئایین و نیشتمان و گەل و خاکەکەی. وەك وڵاتە پێشکەوتووەکان ژیانی خۆش و بەختەوەری و خۆشگوزەرانی بۆ گەنجەکان هەر لەسەر دەستی خۆیان فەراهەم ببووایە. گەنجان

هەستیان بە بەرپرسیاریەتیی تەواو بکردایە. ئاست و توانای گەنجانی وڵاتەکەمان لە هیی وڵاتانی پێشکەوتوو کەمتر نییە، بەڵام جێگەی داخە ئەم دەسەڵاتە بێباك و خۆسەپێنە هیچ دەرفەتێکی بۆ گەنجەکانمان نەهێشتووەتەوە تا ئاسوودە و ئارام بن، بەندە حەقیقەتی ئەم بابەتە دەزانم، بەڵام بۆ ئەوەی بێئومێد نەبین و لە پرۆسەی گۆڕانکاری و هەستانەوە و متمانەبەخۆبوون بەردەوام بین، تەنها بۆ هۆشیاری و ئاگاداری باسی دەکەین، ئەم بابەتە نابێت ببێتە مایەی بێئومێدیمان، بەڵکوو دەبێت بەردەوام بین تا هەموو بەربەستەکان دەبڕین. زۆر باسی ڕۆژئاوا و داهێنانەکانمان کرد، ئەمە تەنها بۆ ئەوەیە بەرچاوڕوون بین و بزانین ئەوان لە ئێستادا چ خزمەتێك بە مرۆڤایەتی دەکەن. عەقڵ و ژیرییان لە موسوڵمانان وەرگرت. لەبیری نەکەین ئێمە وەکوو موسوڵمان خاوەنی دوو شارستانیەتی گەورە و بەرزین؛ شارستانیەتی باوەڕی، کە تەواوی تێڕوانین بۆ ژیان و بوونەوەر و مرۆڤ لەسەر ئەوە وەستاوە. ئەوەی تێڕوانینی لەم بوارەوە بێت، ئەوە تەواوی بیرۆکە و هەنگاوەکانی ڕاست و دروست و تەواون. ئەوەی تێڕوانینی لەسەر باوەڕ نەبێت، هەموو هەنگاوەکانی هەڵەن و لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا نین، وەك ئێستای ڕۆژئاوا. شارستانیەتی دووەمان شارستانیەتی ئەخلاقییە، هەموو سێکتەرەکانی ژیان لەسەر ئەخلاق ڕاوەستاوە، ئەخلاق ئەوەندە گشتگیرە پێویستیی تەواوی ژیانە، ژیان بەبێ ئەخلاق بەرەو ژیانی ئاژەڵیمان دەبات. ڕۆژئاوا لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و داهێناندا کەوتووەتە ناو زەلکاوێکی بێباوەڕی و بێئەخلاقییەوە. ئەو داهێنانانەی کە دەیکات، بەشێکی دەبێتە کارەسات بەسەر مرۆڤایەتییەوە، بۆیە جیهانێکیان لە نائومێدی و بێمتمانەیی و یەکتربڕین و ترس و تۆقاندن و... هتد؛ دروست کردووە. نەبوونی ئەم دوو بنەمایە، خەریکە شارستانیەت و پێشکەوتن و داهێنانی ڕۆژئاوا بڕووخێنێت. گەنجی موسوڵمان لەگەڵ بوونی دوو شارستانیەتی باوەڕ و ئەخلاق، ببێتە خاوەنی داهێنان و تەکنەلۆژیا و پێشکەوتن، بەتەواوی بەختەوەری بۆ کۆی مرۆڤایەتی دەگێڕێتەوە. کاتیەتی گەنج هەوڵی جددی بدات تا سوود لەم پێشکەوتنەی ڕۆژئاوا

ببینێت و لە خزمەتی خۆی و مرۆڤایەتیدا خەرجی بکات. زۆر جار گەنجانێك هەن باسی پێشکەوتنی ڕۆژئاوایان بۆ بکە، وا دەزانن ئەمە سەرسامبوونە بە ڕۆژئاوا، ئەمە بیرکردنەوەیەکی لارە، موسوڵمان جگە لە لایەنی باوەڕ، لە تەواوی لایەنەکانی تر بۆی هەیە سوود لە ئەزموونی مرۆڤایەتی وەربگرێت، مادام تێك ناگیرێت لەگەڵ شەریعەت، ئەمانە کاری ئاسایی و کردەی مرۆڤەکانن، پەیوەندییان بە ئایینەوە نییە، ئایین تەنها لە ڕێگەی قورئان و سوننەتەوە وەردەگیرێت، بەڵام هەوڵی مرۆڤ ئاساییە موسوڵمان سوودی لێ ببینێت. ئیمامی عومەر؛ ئیمامی یەکتاپەرستی و باوەڕ و هەڵوێست، سوودی زۆری لە فارس و ڕۆم وەرگرتووە لە بواری سەربازی و ئیداری و بابەتەکانی تر. بەهەرحاڵ، ئەم نووسینە هەنگاوێکی ترە لە هەنگاوەکانی هەستانەوە و بەرەوپێشچوونی ئوممەت و ئایین و نیشتمانەکەم، کە شەو و ڕۆژم بەیەکەوە ناوە بۆ ئەوەی بەردێك بخەمە سەر یەك، تا هۆشیاری و بیرکردنەوەی دروست و هەنگاوی ڕاست بۆ گیرانەوەی عیزەت و سەربەرزی و ئازادی و ژیان بنێین، ئەمانەش گشتی لەسەر دەستی گەنج بەدەست دێت. ئەم نووسینە هەوڵی بەندەیە بۆ گەنجان، ئەوەی پێکابێتم؛ لە خودا و پێغەمبەرەوەیە (دروودی خوای لەسەر)، ئەوەی هەڵەم کردبێت؛ لە نەفسی خۆم و شەیتانەوەیە، بەم ئایەتە جوانە کۆتایی پێ دەهێنم: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾﴾ (آل عمران: ٨).

د. ئیدریس کاریتانی

٢٠٢٢/٨/٢١

# ناوەرۆک

**دەروازە ........................................................................................................ ٩**

کێ سوود لەم کتێبە وەردەگرێت؟ ........................................................................ ١٢

پێشەکی ....................................................................................................... ١٤

**تەوەری یەکەم: سەرەتا و هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم بابەتە ...................................... ١٦**

گەنجان کێن؟ ............................................................................................. ٢٤

گرنگیی قۆناغی گەنجایەتی .............................................................................. ٢٤

ئەم قۆناغە لە تەمەن بە گرنگترین قۆناغ دادەنرێت، لەبەر ئەم هۆیانە:............................. ٢٤

یەکەم: تەمەنی هێز و بەرهەمهێنانە................................................................ ٢٤

دووەم: چاکترین قۆناغی تەمەنە ..................................................................... ٢٥

سێیەم: تەمەنی مرۆڤ ................................................................................ ٢٥

چوارەم: گەنجان کۆڵەکەی هەموو گەلێکن.......................................................... ٢٦

پێناسەی گەنج............................................................................................. ٢٧

گەنج کێیە؟ ................................................................................................ ٢٧

گەنج لە ڕوانگەی جەستەییەوە.......................................................................... ٢٧

گەنج لە ڕوانگەی عەقڵییەوە ............................................................................ ٢٩

گەنج و داهێنان و هێزی کار ............................................................................ ٣٠

گەنج و گۆڕانکاری ....................................................................................... ٣٠

پلەوپایەی گەنجان لە ئیسلامدا ......................................................................... ٣١

گەنجان لە قورئاندا ................................................................................... ٣١

گەنجان لە فەرموودەی پێغەمبەردا ................................................................... ٣٢

**تەوەری دووەم: گەنجە بەهرەدارەکان ........................................................... ٣٤**

دیارترین سیما و ئاکار و ڕەوشت و کەسایەتیی گەنجی بەهرەدار چین؟ ............................ ٣٦

لە دنیای جیهانگیریدا ئێمە چۆن بەهرەمەندەکان بدۆزینەوە؟ ........................................... ٣٨
تایبەتمەندییەکانی گەنجی بەهرەدار ........................................................................ ٣٩
یەکەم: لە پێکهاتەی گشتیی جەستەیی و مەعنەوی و هزریدا جیاوازن. ............................. ٣٩
دووەم: تێکەڵبوونیان لەگەڵ کۆمەڵگەدا خێرا و کارایە. .......................................................... ٣٩
سێیەم: پەیوەندی دروستکردن .................................................................................... ٤٠
چوارەم: عەقڵیان بەهێزە ......................................................................................... ٤٠
پێنجەم: توانای گوتار و قسەکردن ............................................................................ ٤١
شەشەم: ورد و بەدیقەتە ......................................................................................... ٤١
حەوتەم: دۆستی کتێب و خوێندنەوەیە ........................................................................ ٤١
هەشتەم: ئومێد و تموحاتی هەمەلایەنە ...................................................................... ٤٢
چاودێریکردن و ڕەخساندنی دەرفەت بۆ گەنجی بەهرەدار ............................................... ٤٢
یەکەم: تاقیکردنەوە و ڕاوەرگرتن ............................................................................. ٤٣
دووەم: وەرگرتنی پرسوڕای دایك و باوك .................................................................. ٤٣
سێیەم: بەرەو قۆناغی خولیا و ئامانج و پسپۆڕی .......................................................... ٤٣
گرفت و کۆسپی بەردەم گەنجی بەهرەدار .................................................................. ٤٥
**تەوەری سێیەم: جیهانگیری خاڵە ئەرێنی و نەرێنییەکانی جیهانگیری ................................ ٤٩**
گەنج چۆن دەتوانێت دەرفەت لەو خاڵە ئەرێنییانە وەربگرێت؟ ........................................... ٥٠
دەرفەتەکانی جیهانگیری بۆ گەنج بەبێ جیاوازی ........................................................... ٥١
یەکەم: دەرفەتی گەیاندن ......................................................................................... ٥١
دووەم: دەرفەتی بازرگانی ........................................................................................ ٥٢
سێیەم: دەرفەتی تەکنەلۆژیا و جیهانی ئەلکترۆنی ......................................................... ٥٢
چوارەم: ڕاگەیاندن ................................................................................................. ٥٣
پێنجەم: نووسین و ڕۆژنامەوانی ................................................................................. ٥٣
شەشەم: گەشەی بواری هونەری ............................................................................... ٥٤
حەوتەم: فەراهەمکردنی فێربوونی زمان ...................................................................... ٥٤

هەشتەم: خاوەنی کۆمپانیا ...... ٥٥
نۆیەم: دەرگای زانکۆکانی جیهان بۆ گەنج کراونەتەوە ...... ٥٥
بەکورتی: لایەنە ئەرێنی و چاکەکانی جیهانگیری ...... ٥٦
یەکەم: کردنەوەی دەرگای زانیاری بە ڕووی جیهان...... ٥٦
دووەم: فەراهەمکردنی ژیانی ئیسراحەت ...... ٥٦
سێیەم: زیادبوونی پانتایی ڕۆشنبیری ...... ٥٦
چوارەم: فەراهەمکردنی مافی مرۆڤ و ئازادیی تاك ...... ٥٦
خاڵە نەرێنی و خراپەکانی جیهانگیری ...... ٥٨
یەکەم: نەبوونی هیچ پێشینە و خۆئامادەکردنێك ...... ٥٨
دووەم: دروستکردنی بۆشایی و لێکترازانی خێزان ...... ٥٨
سێیەم: زیادبوونی دیاردەی چاولێکەری...... ٥٩
چوارەم: بەهای مرۆڤەکان لە مەترسیدایە ...... ٥٩
پێنجەم: بردنی خێروبێری وڵاتان ...... ٦٠
شەشەم: بۆشایی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگا ...... ٦٠
حەوتەم: زاڵبوونی کولتووری ڕۆژئاوا بەسەر جیهانی گەنجاندا...... ٦٠
هەشتەم: ململانی و دژایەتیکردن و پێکدادانی شارستانیەتەکان...... ٦١
نۆیەم: لێکدابڕان و گۆشەگیریی تاکەکان بە هۆکاری جیهانگیری...... ٦٢
دەیەم: تێکەڵکرنی تایبەتمەندی و شوناس ...... ٦٢
یازدەیەم: گۆڕینی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی...... ٦٣
دوازدەیەم: ڕەشکردنەوەی گەلان...... ٦٣
سیازدەیەم: بۆشایی نێوان چینوتوێژەکانی کۆمەڵگە ...... ٦٤
چواردەیەم: زیادبوونی ڕێژەی هەژاری ...... ٦٤
پازدەیەم: ڕەشکردنەوەی زمان ...... ٦٥
شازدەیەم: زاڵبوونی وڵاتە زلهێزەکان بەسەر وڵاتە بێهێزەکاندا ...... ٦٥
تەوەری چوارەم: خۆڕۆشنبیرکردنی گەنج ...... ٦٦

هەنگاوەکانی خۆڕۆشنبیرکردنی گەنجان ............................................................ ٦٨
ئاستە جیاوازەکانی گەنج ........................................................................ ٦٩
کارامەییەکان ................................................................................ ٧١
هەنگاوەکانی کارامەیی........................................................................ ٧٢
دەرفەتی یەکەم: فەراهەمکردنی بوارە جیاوازەکانی تەکنەلۆژیای سەردەم بۆ هەموو تاکێك. ............٧٢
دەرفەتی دووەم: مانگە دەستکردەکان.......................................................... ٧٢
چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ جیهانگیریدا بکەین، یان چۆن سوودی لێ وەربگرین؟ ........................٧٥
جیهانگیری چییە؟ ............................................................................ ٧٧
جیهانگیری کەی دەستی پێ کرد؟ ............................................................. ٧٧
سوود و زیانەکانی جیهانگیری بابەتی مشتومڕی بەردەوامە........................................ ٧٩
١. ئاڵوگۆڕی کولتووری و بیرکردنەوەی کراوە...................................................... ٧٩
٢. زیادبوونی ڕۆیشتنی سەرمایە و دەستڕاگەیشتن بە بازاڕی هەمەچەشنتر.............................. ٨٠
٣. بەرهەمی باشتر بە نرخێکی کەمتر ............................................................ ٨٠
٤. هاوبەشکردنی زانیاری و تەکنەلۆژیا .......................................................... ٨٠
٥. هێزی کاری کالیبەری بەرزتر ................................................................ ٨٠
سوودەکانی جیهانگیری چین؟ .................................................................... ٨١
١. دەستڕاگەیشتن بە کولتوورە نوێیەکان ........................................................ ٨١
٢. بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆژیا و داهێنان............................................................ ٨١
٣. کەمکردنەوەی تێچوون بۆ بەرهەمەکان.......................................................... ٨١
٤. ئاستی باڵای ژیان لە سەرانسەری جیهاندا ..................................................... ٨٢
٥. دەستڕاگەیشتن بە بازاڕە نوێیەکان ............................................................ ٨٢
٦. دەستڕاگەیشتن بە بەهرەی نوێ ............................................................... ٨٢
ئاڵنگارییەکانی جیهانگیری چین؟................................................................ ٨٣
١. دامەزراندنی نێودەوڵەتی ..................................................................... ٨٣
٢. بەڕێوەبردنی کۆچبەریی کارمەندان ............................................................ ٨٣

٣. وەرگرتنی باج و کرێی هەناردەکردن........................................................................٨٤
٤. ئاڵنگاریی مووچە و پابەندبوون ........................................................................٨٤
٥. لەدەستدانی ناسنامەی ڕۆشنبیری ........................................................................٨٤
پێناسەی جیهانگیری........................................................................٨٥
ڕەهەندەکانی جیهانگیری ........................................................................٨٦
یەکەم: ڕەهەندی فیکری........................................................................٨٧
دووەم: ڕەهەندی سیاسی ........................................................................٨٧
سێیەم: ڕەهەندی کۆمەڵایەتی ........................................................................٨٨
چوارەم: ڕەهەندی تەکنەلۆژی ........................................................................٨٩
پێنجەم: ڕەهەندی ڕۆشنبیری ........................................................................٨٩
شەشەم: ڕەهەندی ئابووری........................................................................٩٣
**تەوەری شەشەم: گەنجی داهێنەر ........................................................................ ٩٥**
پێناسەی گەنجی داهێنەر ........................................................................٩٥
جیاوازیی نێوان گەنجی داهێنەر و گەنجی بێبەرنامە........................................................................٩٧
گەنجی داهێنەر ........................................................................٩٧
١. گەنجی داهێنەر سەربەخۆیە لە بیرکردنەوەدا........................................................................٩٧
٢. تێڕامان و بیرکردنەوە ........................................................................٩٧
٣. کەڵکوەرگرتن لە جیهانی تازە ........................................................................٩٧
٤. چاونەترسی لە بڕیاردان........................................................................٩٧
گەنجی بێبەرنامە ........................................................................٩٨
١. بێبەرنامەیە........................................................................٩٨
٢. بێئامانجە لە ژیان........................................................................٩٨
٣. کاتبەفیڕۆدەرە........................................................................٩٨
٤. دنیا لە دۆڵێکە، ئەو لە دۆڵێکی ترە. ........................................................................٩٨
٥. هەست بە بەرپرسیارێتی ناکات........................................................................٩٨

٦. خاوەنی هیچ نییە. ........................................................................٩٨
٧. گرنگی بە دارایی و بەهێزکردنی دارایی خۆی نادات. ........................................٩٨
٨. هەندێک جاریش خۆی سەرخۆش و بێهۆش دەکات.............................................٩٨
٩. گۆشەگیر و تەنهایە. .........................................................................٩٨
١٠. خۆی ناناسێت. ...............................................................................٩٨
بەربەست و ڕێگریی بەردەم گەنج و داهێنان ...................................................٩٩
کۆسپی یەکەم: نەبوونی سیستمی ڕێکخستنی ژیان ........................................١٠٠
کۆسپی دووەم: نەبوونی دارایی و ئابوورییەکی باش لەبەر دەستی گەنج...................١٠٠
کۆسپی سێیەم: لەمپەری کۆمەڵایەتی ........................................................١٠١
کۆسپی چوارەم: نەخوێندەواریی دێهاتیی پەرگیر ..............................................١٠٢
کۆسپی پێنجەم: نەبوونی هیچ هاریکاری و هاوکارییەکی حکومەت بۆ گەنجان ..................١٠٢
چیمان لە گەنج دەوێت؟ ..........................................................................١٠٥
**تەوەری حەوتەم: گرنگیی داهێنان ............................................................١٠٨**
گرنگیی داهێنان لە ژیانی گەنج.................................................................١٠٩
داهێنان چییە؟ ....................................................................................١١٠
قۆناغە پێویستەکانی داهێنان.....................................................................١١١
پێکهاتە و بنەماکانی داهێنان ....................................................................١١٤
ڕێگری و لەمپەرەکانی بەردەم داهێنان و نوێکاری ..............................................١١٦
**تەوەری هەشتەم: ئارامیی هزر...............................................................١١٩**
ئەی گەنج، ئاوا بیر بکەرەوە!.....................................................................١٢١
بایەخ و گرنگیی ئاسایشی هزری بۆ تاك و بەتایبەتی بۆ گەنج ..................................١٢٢
مەبەست لە ئاسایشی فیکریی گەنج چییە؟.......................................................١٢٣
**تەوەری نۆیەم: بەرپرسیاریەتیی پاراستنی ئاسایشی هزری .....................................١٢٧**
خاڵە نەرێنییەکانی نەبوونی ئاسایشی هزریی گەنجان ...........................................١٣٢
**تەوەری دەیەم: گەنج و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان (سۆشیالمیدیا)..................................١٣٥**

**تەوەری یازدەیەم: گەنج و هەستانەوە ........................................................ ١٤٠**

یوسف (سەلامی خوای لەسەر) و داهێنانی ئابووری........................................ ١٤١

گەنجانی کەهف و داهێنانی ڕووبەڕووبوونەوەی ستەم........................................ ١٤٢

گەنجانی دەوری پێغەمبەر و داهێنان ........................................................ ١٤٢

گەنج و هەستانەوەی ئوممەت.................................................................. ١٤٣

زوبەیری کوڕی عەوام ............................................................................ ١٤٤

تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا.......................................................................... ١٤٤

سەعدی ئەبووەقاس ............................................................................... ١٤٤

ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم........................................................................... ١٤٤

ئەگەر بێینە سەر مەیدانی زانست، کەسانێکی وەکوو چوار پێشەوا بەڕێزەکە ................ ١٤٥

ئیمامی شافعی ..................................................................................... ١٤٥

ئیمامی بوخاری ..................................................................................... ١٤٥

ئیبن تەیمیە.......................................................................................... ١٤٥

عیزی کوڕی عەبدولسەلام ........................................................................ ١٤٦

محەمەدی کوڕی قاسمی سەقەفی ................................................................ ١٤٧

تاریقی کوڕی زیاد ................................................................................. ١٤٧

عەبدولڕەحمان ناسر............................................................................... ١٤٧

ئیبن ئەبوعامر ...................................................................................... ١٤٨

با بەراوردکارییەکی کورت بکەین لەم کۆمەڵە قسەیەی پێشوو لێی دواین.................... ١٤٨

یەکەم: نەبوونی شەڕ و ئاژاوە لە ڕۆژئاوا ..................................................... ١٤٨

دووەم: بنەمای هاوڵاتیبوون....................................................................... ١٤٨

سێیەم: بنەمای دادپەروەری ....................................................................... ١٤٩

**تەوەری دوازدەیەم: کۆمەڵێك ئامۆژگاری بۆ گەنجانی سەردەمی جیهانگیری ........................ ١٤٩**

ئامۆژگارییەکان...................................................................................... ١٥٠

ئامۆژگاریی یەکەم: ڕازینەبوون بە دواکەوتوویی و پاشەکشە .................................. ١٥٠

ئامۆژگاریی دووەم: گرنگیدان بە زانست ........................................ ١٥٠
ئامۆژگاریی سێیەم: گرنگیدان بە زانیاریی تەکنەلۆژی ........................................ ١٥١
ئامۆژگاریی چوارەم: هۆشیاری ........................................ ١٥١
ئامۆژگاریی پێنجەم: هیممەتبەرزی ........................................ ١٥٣
ئامۆژگاریی شەشەم: دوورکەوتنەوە لە لاساییکردنەوە ........................................ ١٥٤
ئامۆژگاریی حەوتەم: دوورکەوتنەوە لە بیرۆکەی ڕووخێنەر ........................................ ١٥٤
ئامۆژگاریی هەشتەم: بەردەوام بە لە ئەزموون و لە چەندبارەکردنەوە ........................................ ١٥٥
ئامۆژگاریی نۆیەم: گرنگیدان بە وەرزش ........................................ ١٥٦
ئامۆژگاریی دەیەم: گرنکی بە کەسە نزیك و هاوبیرەکانت بدە ........................................ ١٥٦
ئامۆژگاریی یازدەیەم: کار و کردەوە تایبەتەکانی خۆت لەبیر مەکە ........................................ ١٥٦
ئامۆژگاریی دوازدەیەم: گەشتکردن و گەڕان ........................................ ١٥٧
میسکێك پێشکەش بە گەنجی گوڵ ........................................ ١٥٨
**ناوەرۆك** ........................................ **١٦١**



بەرەو چارەسەرێکی گونجاو

# گەنج و جیهانگیری

دنیا بە خێراییەکی یەکجار سەیردا تێدەپەڕێت، بەرهەمەکانی جیهانگیری ڕۆڵی سەرەکییان لە بەرەوپێشبردن و خێراکردنی ژیان هەیە، هیچ بوارێکی ژیان وەك خۆی نەماوەتەوە، هەمووی بە سەدان جار لە پێشوو خێراتر بووە. داهێنانەکان بە هۆکاری بەرهەمەکانی جیهانگیری بە ئەندازەیەك بەرەوپێش چوون، ژیانی مرۆڤەکانی کردووەتە ئەلکترۆنیات و هەستەوەر، خزمەتێکی بێوێنەیان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە. لە مێژووی هاتنی مرۆڤ بۆ سەر زەوی، بە ئەندازەی ئێستا مرۆڤ پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەبینیوە.


**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی



/TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com



نرخی 6.000 دینار





9 789922 679549